# العُذر بالجهل



## بەڵگە ڕوونەکان لە نەبونی و وڵامی گومانەکانی


نوسینی : ابو همام



ئامادەکردنی : پێگەی نهاوند




## پێشەکی

**الحمد لله معز الإسلام بنصره ومذل الشرك بقهره ومصرف الأمور بأمره ومستدرج الكفار بمكره الذي قدر الأيام دولا بعدله، وجعل العاقبة للمتقين بفضـله، والصلاة والسلام على من أُعلى الله منار الإسلام بسيـفيـه، أمَّا بعد:**

بەڕاستی کەوتوینەتە نێو سەردەمێک کە تێیدا بانگەشەکاران بۆ ناوی تەوحید تێیدا زۆر بووە، بەڵام زۆررینەیان تەنها بەناو بانگەشەی تەوحید دەکەن بەڵام لە ناوەڕۆکی ئەو بانگەشەیەیاندا بیروباوەڕی شەیطان و زەندیق و مورتەدەکانی ئەم ئوممەتەیان تێدا باس دەکرێ و دەیکەن بە مەنهەج بۆ فێرخوازە سەرەتایەکان، بانگەشەکەرەکان شەیطانێکن لە سەر ڕێگاکان وەستاون بۆ هەڵخەڵەتاندن و شێواندن و گومڕا کردنی خەڵکی، ئەمەش شتێکی سەیر نیە لەبەر ئەوەی بەڵێنی شیطانە کە ووتی(**لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَاطَكَ الْمُسْتَقِيمَ**)[**الأعراف/١٦**] واتە: سوێند بێت منیش لەسەر ڕێگا ڕاستەکەی تۆ بۆیان دابنیشم بۆ گومڕا کردنیان.، جا ئەم شەیطانانە لە سەرەتا و کۆتا هەر ـئەمە کاریانە و هەر لەپێناو گومڕا کردنی خەڵکی تێدەکۆشن و هەوڵدەدەن، جا شیطانە ئینسانەکان ـی ئەم سەردەمە لەبەرگی پیاوی ئاینی و بانگخـواز و زانا و موفتی.. دێ ووتار و کۆڕ و مەجلیس دەکا بەناوی ئەوەی خۆی پێ کەسێکی موەحیدە و بانگەشەی ئەو تەوحیدە دەکات و لەڕاستیـدا بانگەشـە بۆ ڕێگـاکانی شیطانەکان دەکەن، جا لەم سەردەمەی خۆماندا بەهۆی نامۆ بوونی ئەم تەوحیدە بەهۆی نامۆ بوونی ناوەڕۆکی ئەم تەوحیدە بەهۆی نامۆ بوونی هەڵگرانی ئەم تەوحیدە، زۆرێ لە بانگەشەکارانی ڕێگای شیطان هاتوون بەناوی ئەم تەوحیدە پاکەوە شتانێکیان تێدا زیاد کردوە بە ئارەزووە پیسەکەی خۆیان و شتانێکیان لێی کەم کردوە بە ئارەزووەکانیان، تەنها لەپێناو ئەوەی لە گەڵ ئارەزووەکان و عەقڵە پوچەکانیان و مەصڵەحەتەکەیان بگونجـێ، یەکێک لەو کارە شیطانیانەیان کە بانگەشەی بۆدەکەن بە ناوی توحید و ئەهلەکەی تەکفیری کافر و موشریکانیان لە دینی رب العالمین نەهێشت وایان لێ کرد تەکفیری کافران کەوا پلە و پایەکی تایبەت و پیرۆزی هەیە لە نێو ئەم ئیسلامە و ئەمر بە شوێنکەوتوانیان کراوە تەکفیری یان بکەن، جا بەهۆی ئەوەی لە گەڵ ئارەزووەکانیان نەگونجا و بە عەقڵە پوچەکانیان نەبوو

ئیدی تەکفیری کافر و موشریکانیان بە شتێکی مەترسیدار و فیتنە و مفسدە نیشان دا لە لایـەن خەڵـکی و بەناوی تەوحید، وە بە ئارەزوەکانیان شتانێکیان زیاد کرد کەوا هیچ بنەمایەکی نییە لە دینی رب العالمین ـدا و بگرە پێچەوانەی ووتەی الله و رسولەکەیەتی، کەوا هاتوون کۆمەڵێ مەرجیان داناوە وزیادیان کردووە بۆ تەکفیرکرنی کەسی کافر و موشریک کەوا هیچ دەقێکی قورئان و سوننەتی لەسەر نیە و پێچەوانەیـەتی و دەستیان کرد بە قسە هەڵبەستن و دۆر هەڵبەستن بۆ الله تعالى و رسولەکەی ، بەناوی ئەهلی سوونە و جەماعە کۆمەڵێ ووتەیان نەقڵ کردوون و لێکدانەوەیان بۆ کردوون و بوختان و تۆمەتێکی زۆر خەراپیان داوەتە پاڵ زانایانی ئەم ئوومەتە،

جا یەکێک لەو بابەتانـەی کەوا کەمکردن و زیادکردنیان تێدا کرد بە هەوەسی خۆیان و بەکۆمەڵە گومانێکەوە ئەوە بوو عوزر بۆ کەسێ دەهێننەوە کە دەکەوێتە نێو کوفر و شیرک بە نەزانی بەبێ هیچ بەڵگەیەک و زانینێک و لێک جیاکردنەوەی ناوەڕۆی ئەم بابەتە، کەوا ئەم بیروباوەڕە تێکدان و وێرانکردنی بیروباوەڕ و توحیدی موەحیدە بابەتێکی زۆر هەستیار و گرینگە کەوا شیطانەکانی ئەم سەردەمە بیروباوەڕی گومڕایانی پێشینانی خۆیانیان نوێکردۆتەوە کەوا نەوەکانی جەهمی کوڕی صفوانن، ئەمەش ڕێگای توحید و ئەهلەکەیەتی کەوا بەردەوام ناحەز و دوژمنان و گومڕایان هەوڵدەدەن بێنە سەر ئەم ڕێگایە و بیشێوێنن و پەیوەستبوانی ئەم ڕێگایە هەڵبخەڵەتێنن و بەکۆمـەڵێ گومانەوە،

جا بۆیە بە کارێک و ئەرکێکی گرینگم زانی موسڵمانان و ئەوانەی کەوتونەتە نێو ئەم بیروباوەڕە ئاگاداریان بکەمەوە و ئەم بابەتە بەڕون و ئاشکرایی بخەمە بەردەم خوێنەر، هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نەمێنێ و بەڵگەکان بخەمە ڕوو و گومانەکان بڕەوێنینەوە بإذن الله تعالى

داواکارم لە رب العالمین نیەتی دڵمان تەنها بۆ خۆی پاک بکاتەوە و هیدایەتمان بدات بۆ سەر ڕێگا ڕاستەکەی و بمانپارێزێ لەوانەی غەزەبی خۆی بەسەراداون و لەوانەی گومڕایی کردوون.. اللهم امين

١٤٤١/٧/٩ هجری

## بەڵگەکان لە قورئان دا

پێم باش بوو سەرەتا بەڵگەکان بخەمە ڕوو بۆ خوێنەر ئینجا دواتر بابەتەکانی تری ئەم مەسەلەیە ان شاءالله تعالی- بەڵگەکان لە ووتەی رب العالمين گەلێ زۆرن بەڵام لەبەر درێژ نەبونەوەی بابەتەکە بەشێکی بەڵگەکان دادەنێین بۆ ئەوەی ڕوون بێت لەلای گشتی ئایا لەلای الله تعالی عوزر بۆ کەسی نەزان کە کەوتبێتە نێو کوفر و شیرکە و هێندراوەتەوە یان الله تعالی نەفی عوزر بۆ کەس نەزانی کردووە، جا دەچینە سەر بەڵگەکان، تێبینەک بەر لەوەی بچینە سەر بەڵگە و ناوەڕۆکی بابەتەکە: جوان لە دەقەکانی دامناون و ووتەکان وورد ببنەوە و بەدڵێیکی حەق مەبەستەوە بڕۆنە ناوی، با خوێندنەوەکە هەر خوێندنەوەی زمان نەبێ و دڵ لێی تێنەگا.

## بەڵگەی یەکەم

---------------

الله تعالی دەفەرموێت: **(وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ)[توبة/٦]**

واتە:ئەگەر یەکێ لە موشریکان هانای بۆتۆ هێنا بۆ ئەوەی بیپارێزی، ئەوە بیپارێزە تا گوێبیستی قسەکانی خودا دەبێت،ئینجا پێی ڕابگەیەنە کە مایەی خۆپارستنەکەت ئیمانهێنانە بەالله، ئەمەش لەبەر ئەوەیە ئەوان گەلێکی نەزانن.،

ئیمامی تەبەری دەڵێت:خودای تعالی بۆئاگادار کردنەودەفەرمووێت ئەی محمدئەگەر یەکێک لە موشریکەکان داوای ئەمانی لێکردی پاش ئەوەی فرمانم پێکردی بە شەڕ وکوشتاریان دوای تەواو بوونی اشهر الحرام یەکێک لەتۆوە گوێی لەکەلامی خودا بێت کەئەویش قورئانە کەدایبەزاندووە بۆت پاداشتەکەی ئەوەیە کەدەڵێت :ئەمینی پێ بدە هەتاوکوگوێڕایەڵی کەلامی اللەدەبێت وتۆبۆی دەخوێنیتەوە پاشان بیگەیەنە ئەمنیەتەکەی دەڵێت:پاشان بیگەڕێنەوە دوای

بیستنی کەلامی الله ئەگەر نکۆڵی کرد ئیسلام بێت و بەئاگانەهاتەوە بەوەی بۆت خوێندۆتەوە لە کەلامی الله و ئیمان بێنێت بۆ جێگای ئەمینەکەی... **ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لاَ يَعْلَمُونَ**

و دەڵێت : ئەوەیان بەسەردێنی بەهۆی ئەوەی ئەمانت پێ بەخشیون بۆ ئەوەی گوێڕایەڵی کەلامی الله بن و گەڕانەویان لەلایەن تۆوە بۆ ئەوەیە ئیسلامیان قبوڵ نەکردووە بۆ جێگا ئەمنیەتەکەیان لەبەر ئەوەی قەومێکی جاهلن و تێناگەن لە الله و حوجە و نازانن هیچیان بە ئیمان بە الله وە نەماوە ئەگەر ئیمان بێنن تاوان و خراپەیان لەسەر نیە لەوازهێنانیان لە ئیمان بە الله.

بەغەوی دەڵێت : ئەوەی لەسەرین و لەسەریانە لە چاکە و سزا هەتا گوێبیستی کەلامی الله بوون(**ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لاَ يَعْلَمُونَ**) واتە : هیچ لەدینی الله و تەوحیدەکەی نازانن

حەسەن دەڵێت:ئەم ئایەتە مەحکەمەیە تاڕۆژی قیامەت

تەفسیری ئیبن کەسیر دەڵێت : الله تعالی بە پێغەمبەر دەڵێت (ئەگەر یەکێک لەوموشریکانەی وافرمانم پێکردوی بەکوشتار کردنیان وماڵ وسامانیانم بۆحەڵاڵ گردووی داوای ئەمینی لێکردی ئەوا وڵامی داواکەی بدەوە تاوەکو گوێبیستی کەلامی اللهدەبێت واتە قورئانی بۆبخوێنەوە وباسی شتێک لەو کارانەی بۆبکە (واتە دین وبەجێهێنانی حوجەی الله.پاشان بیگەیەنە ئەمنیەتەکەی واتە بەرداوام لەئەمان دابێت تادەگەڕێتەوە وڵات یان ماڵەکەی خۆی ذلك بأنهم قوم لا يعلمون )واتە ئەمانمان کرەدەشەرع بۆئەوانە بۆئەوەی دینی اللەبزانن ودەعوەی اللەبڵاو بێتەوە لەناو عەبدەکانی.

جا الله تعالی ناوی نان موشریک بەر لەوەی گوێیان لە حوجە بێت کە بریتیە لە کەلامی الله تعالی، ڕونی کردۆتەوە کەوا ئەوانە عوزریان نیە هەر وەک و ناویهێنان بە موشریک لە گەڵ ئەوەی جەهلیان هەبوو کەوا علمیان نەبوو هەر وەک و فەرموی(**بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ**)جا ناوی شیرکیان لەسەری جێگیر بوو بەر لەوەی گوێیان لە حوجەکە بێت، ئەوانە هەر گوێیان لە قورئان نەبوو ئینجا ناوی شیرکیان بەسەردا جێگیر کرا و عوزریان بۆ نەهێندرایەوە، جا چۆن خەڵکی ئەم زەمەنەی ئێستا عوزریان بۆ هەیە بە نەزانین ،کەوا قورئانیان لەبەر دەست دایە بەزمانەکەی خۆیان بە سەوت و نوسین و تفسیرەوە و... بە گشت ئاسانکاریەک بۆ خەڵکی،

ئەوەمان بۆ دەرکەوت کەوا سیفەت و ناوی کردارەکە بەسەر خاوەنەکەی جێگیر دەبێ جا گەر حوجەی پێ گەشت بوو یان نەگەیشتبوو، وە ئەوەمان بۆ ڕون بووەوە کەوا کەسی کافر و موشریک هیچ عوزرێکی نیە و پێی نادرێ بەر لە گەیشتنی حوجە پێی وە پاش گەیشتنیشی، هیچ عوزرێ نیە بۆ هیچ کەسێ کەوا بکەوێتە نێو هەرمسائیلێکی ظاهیری و کوفر و شیرکێک جا حوجەی پێگەیشتبێت یان نەگەیشتبێت.

**بەڵگەی دووەم**

---------------

الله تعالى دەفەرموێت : **(لَمْ يَكُنِ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَالْمُشْرِكِينَ مُنفَكِّينَ حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ الْبَيِّنَةُ-رَسُولٌ مِّنَ اللَّهِ يَتْلُو صُحُفًا مُّطَهَّرَةً)[البينة/١]**

**واتە: ئەوانەی بێ باوەڕ بوون لە خاوەنی کتێبەکان لەگەڵ موشريك و هاوەڵگەران، وازيان لە بيرو باوەڕی خۆيان هێنا، هەتا بەڵگەو نیشانەی ڕوون و ئاشکرايان بۆ نەهات**

الله تعالى ناوینان موشریک بەر لەوەی پێغەمبەریان بۆ بێت، بەر لەوەی حوجەیان پێ بگات، جا حوجەش بریتیە لە رسول الله صلى الله عليه وسلم، جا الله تعالى بەر لەوەی ئەو حوجەیەیان پێ بگات حوکمی موشریکی لەسەردان، جا گشت کەسێ کەوا دەکەوێتە نێو شیرکەوە حوکمی موشریکی لەسەر دەدرێت ئەگەر بە ووتەیەکیش بێت، جا حوجەکەی پێ گەیشت بێت یان نەگەشتبێت، هەر وەک و الله تعالى لەم ئایەتەدا زۆر بە ڕوونی حوکمی کەسانێکمان بۆ ڕوون دەکاتەوە و بە موشریک ناویان دەهێنێ بەر لەوەی حوجەیان بۆ بێت و پێیان بگات، جا چۆن و بە دەلیلێ بەکەسێ دەڵێی عوزری هەیە کەوا حوجەی پێ گەیشتوە؟ چۆن دەڵێین نابێ بەکافر یا موشریک ناوی بێنی تا حوجەکەی پێ دەگات و بۆی ڕووندەبێتەوە تەواو؟؟!

شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە دەڵێت: حوجە پێغەمبەری خودایە صلى الله عليه وسلم ولەسەرخەڵکە بەگەیشتن وبیستنی .واللەتعالی ناوی ناون وحوکمی لەسەر داون بەکوفر وشیرک پێش هاتنی پەیام وپێش گەیشتنی حوجەی پێیان وپێغەمبەریان بۆبنێردرێت ،وئەوە ناوێکی پێویستەبۆیان ووەسفێکی شایەنە بەحاڵیان وهەرکەسێک شیرک ئەنجام بدات ناودەبرێت بەموشریک گوتەیەکی تاکەو هیچ ئیختیلافی تێدا نیە.

## بەڵگەی سێیەم

----------------

بالله تعالی دەفەرموێت : **(فَرِيقًا هَدَىٰ وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيْهِمُ الضَّلَالَةُ إِنَّهُمُ اتَّخَذُوا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِ اللَّهِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ)[الاعراف/٣٠]**

واتە: دەستەیەک هیدایەت و ڕێنمووی وەرگرتووە، دەستەیەکیش بڕیاری گومڕای و سەر لێشێواوی بەسەردا چەسپاوە، چونکە بەڕاستی ئەوانە بێجگە لە خوا شەیتانەکانیشیان کردە پشتیوان و خۆشەویستی خۆیان، واش دەزانن کە ڕێگەی ڕاست و دروستیان گرتۆتەبەر.

جا الله تعالی لێرەدا باسی دوو دەستەمان بۆ دەکات لە خەڵکی، یەکێکیان لەسەر حەق و هیدایەتە، ئەوی تریشیان لە سەر گومڕایە و گومڕایەکەیان بەسەر دا چەسپاوە لەبەر ئەوەی شوێن شیطانە ئینسان و جنەکان کەوتوون و لەڕێگا لایانداون و نەزانن هەروەک و الله تعالی فەرموی**(وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ)** واش حیساب دەکەن کەوا بەڕاستی لەسەر هیدایەتن، جا خۆی نەزانەکان هەر وادەزانن لەسەر هیدایەتن بۆیە گومڕا و سەرلێشێواو دەبن، جا الله تعالی لە گەر ئەو نەزانینەشیان لە دەستەی یەکەمی موسڵمانان و هیدایەت دراوانی حیساب نەکردن، بەڵکو لە دەستەی گومڕا و موشریکانی حیساب کردن و هیچ عوزرێکی بۆ نەهێنایەوە.

## بەڵگەی چوارم

----------------

الله تعالی دەفەرموێت : **(قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالًا-الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا-أُولَٰئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ وَلِقَائِهِ فَحَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنًا-ذَٰلِكَ جَزَاؤُهُمْ جَهَنَّمُ بِمَا كَفَرُوا وَاتَّخَذُوا آيَاتِي وَرُسُلِي هُزُوًا)[الكهف/١٠٣-١٠٦]**

واتە:بڵێ:ئایا ئاگادارتان بکەمەوە و هەواڵی ئەوانەتان پێ بدەم کە خاوەنی زەرەرمەندترین کار و کردەوەن؟، ئەوانەی هەوڵ تێکۆشانەکانیان تێدا جوو لە ژیانی دونیا دا، بەمەرجێک وای دادەنێن کە کار و کردەوەی چاکە دەکەن، ئەوانە ئەو کەسانەن کە بێباوەڕبوون بە پەروەردگار و بەدیداری، جا کردەوەکانیان تێداچوون ئێمەش لەڕۆژی دواییدا هیچ سەنگێکیان بۆ دانانێین، ئەو جەهەندەمە سزای ئەوانە،بەهۆی ئەو بێباوەڕیەی دەیان کرد، نێردراو و بەڵگەکانی منیان بە گاڵتەجاڕیەوە وەرگرت.،

الله تعالی حوکمی کوفری لەسەردان لە گەڵ ئەوەی نەزان بوو، لە گەڵ ئەوەی کار و کردەوەیەکی زۆریان کردبوو و وایان دادەنا و حیسابیان دەکرد کەوا بەڕاستی لەسەر هیدایەتن و کارێکی چاک دەکەن، بەڵام الله تعالی لە گەڵ ئەو نەزانین و هەست پێ نەکردنەیان هیچ عوزرێکی بۆ نەهێنانەوە بەڵکو هەر لەسەرەتا بە خەسارەت مەند وەسفی کردن، و گشت کارەکانی کردبویان پوچەڵ بوویەوە و حوکمی کوفری بەسەر دان.

لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ئیبن جریر دەڵێت : ئەوە دەگەیەنێت لەبەڵگەکاندا لەسەر هەڵەیی ئەو ووتانەی پێیان وایە هیچ کەسێ کافر نابێت بە الله تعالی ئیلا مەبەستی کوفر بێت لەپاش ئەوەی زانستی هەبوو بە تاک و تەنهایی الله تعالی، وە ئەم ئایەتە الله تعالی تێیدا هەواڵی ئەوانەمان پێ دەدات و وەسفیانمان بۆ دەکات بەسیفاتەکانیان، کەوا بەڕاستی ئەو هەوڵدانەی لە دوونیادا هەوڵیان لەبۆی داوە گومڕاییە ئەگەر چی واشیان حیساب دەکرد کار و کردەوەی چاکە دەکەن، وە هەواڵی ئەوەشی پێداین کەوا ئەوانە بێباوەڕ بون بە ئایەتی پەروەردگاریان، وە ئەگەر بە ووتەی ئەوانە بیت کەوا پێیان وایە هیچ کەسێ کافر نابێ بە الله ئیلا لەپاش ئەوەی

زانستی پێی هەبوو ئەوە واجب دەبێ لەبۆیان بە ئەجر و پاداشت پێ دانیان هەر وەک و الله تعالی دەربارەی ئەوانە هەواڵی پێداین کەوا حیساب دەکەن کە کار و کردەوەی چاکە دەکەن، بەڵام لەڕاستی دا ئەو ووتەی ئەوانە پێچەوانەی ووتەی الله ـیە، الله تعالی هەواڵی ئەوانەی پێ داین کەوا کافرن بە الله و کردەوەکانیان هەڵوەشاوەتەوە.

و ابن کثیر دەڵێت : بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە عەمرەوە ئەویش لە موصعەبەوە دەڵێت: پرسیارم کرد لەباوکم واتە: سعدی کوڕی ئەبی وەقاس لەم ئایەتە**(قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالًا)** ئایا ئەوانە حەروریەکانن؟ ووتی: نەخێر ئەمانە یهود و نساران، لەبەر ئەوەی پێغەمبەریان بە ڕاست نەدەزانی وە یهودیەکان باوەڕیان بە بەهەشت نەبوو و دەیان ووت:خواردن و خواردنەوەی تێدا نیە، حەروریەکانیش ئەوانەن کەوا لەپاش ئەوەی پەیمان بە الله دەدەن دەیشکێنن، سعد هەر بە فاسقەکان ناوی دەبردن، علی کوڕی ئەبو طالب و زحاک ووتویانە: ئەوانە حەروریەکانن، بەم قسانە بێت وا دەردەکەوێت ئەم ئایەتە چۆن حەروریەکان دەگرێتەوە بەپێی قسەی علی بێت یهود و نسارا دەگرێتەوە، ئەم ئایەتە تایبەت نەهاتۆتە خوارەوە بۆئەمانە، بەڵکو ئایەتێکی گشت گیرە، لەبەر ئەوەی ئەم ئایەتە لەمەکەدا دابەزیوە بەر لەوەی ڕوی ووتەکانی بکاتە یهود و نسارا، وە بەر لە هاتنی خەواریج بە گشتی، بەڵکو ئەم ئایەتە هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کەوا لە سەر ڕێگایەکی جگە لە ڕێگای ڕەزامەندی الله ـن وە خۆشیان وا حیساب دەکەن کەوا زۆر چاکە و پێکاویانە، بەڵام نەیان پێکاوە و کردارەکانیان لێ وەرناگیرێت، هەر وەک و الله تعالی لەم ئایەتە دەفەرموێ**(وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ خَاشِعَةٌ-عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ-تَصْلَىٰ نَارًا حَامِيَةً)** وە دەفەرموێت : **(وَقَدِمْنَا إِلَىٰ مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاءً مَّنثُورًا) ....)**

جا ئەم ئایەتە گشتگیرە بۆ هەموو ئەو کەسانەی دەکەونە نێو کوفر و شیرک و ئیجتهاد دەکەن و کار و کردەوەی زۆر دەکەن و پێیان وایە لەسەر هیدایەتن، بەڵام الله تعالی لە گەڵ ئەو نەزانیەن و مەبەستەشیان عوزر بۆ هیچ یەکێک نایتنەوە بەڵکو سیفات وناوی کردارەکانیان لەسەر جێگیر دەکا.

**بەڵگەی پێنجەم**

---------------

الله تعالی دەفەرموێت : (**وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ-لا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ**)[توبة/٣٥-٣٦]

واتە: ئەگەر پرسیاریشیان لێ بکەی ئەوان دەڵێن:بەڵکو بۆ گەمە و گاڵتە دەچوینە نێو ئەم باسەوە، بڵێ:ئایا بەخودا و بەڵگە و پێغەمبەرەکەی گاڵتەتان دەکرد؟-بیانوو مەهێننەوە، بەدڵنیایی کافر بوون دوای ئەوەی ئیمانتان هێنابوو.،

ئەم ئایەتە لەسەر کەسانێ دابەزی کەوا صحابی رسول الله بون صلی الله علیک وسلم، وە لە جیهاد دەگەڕانەوە لە گەڵ رسول الله، قسەیەکیان کرد نەیانزانی کوفرە ووتیان تەنها گەمە و گاڵتەمان دەکرد هەر وەک و الله تعالی بەڕاستیدانان لە نەزانیان(**لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ**)، جا الله تعالی لەگەڵ ئەوەی صحابی بون لەگەل رسول الله ـش لەجیهاد بوون هیچ عوزرێکی پێ نەدان و ڕاستەوخۆ حوکمی کوفری بەسەردان(**لا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ**) جا الله تعالی حوکمی کوفری بەسەردان و فەرموی عوزر مەیننەوە، کەوا بەر لەو کارەیان ئیماندار بون و بەو قسەیان کافر بون(**بَعْدَ إِيمَانِكُمْ**) هەروەک و شیخ محمدی کوڕی عبدالوهاب لە(کشف شبهات)دەربارەی ئەو کەسانە دەڵێت: کافربون بە قسەیەکیان لە گەڵ ئەوەی لەسەردەمێک دابون لە گەڵ رسول الله دابون لەجیهاد و نوێژکردنیاندا و زەکاتیان دەدا و حەجیان دەکرد.

جا لەگەڵ ئەم بەڵگە ڕونانە، ووتانێکی سەیر هەیە دەڵێن: گاڵتەکردن بە دین و قسە ووتن بە الله و رسولەکەی کوفرە، جیاوازی دەکەن لە گەڵ کردەوە شیرکیەکان و هەڵوەشێنەرەوە ووتە و کرداریەکان، ئەوە شیرکە عوزری بۆ نیە ئەوەش شیرکە عوزری بۆ خاوەنەکەی هەیە!! پێیان دەڵێین بە چ دەلیلێک جیاوازیت لەنێوانیان کرد، کەوا هەمویان کوفرن و شیرکن چ جیاوازیەک هەیە لە نێوان هەڵوەشێنەرەوەی گاڵتەکەر و نەزانێکی غیر مکرهـ و دلیلت چیە؟؟! لەڕاستیدا ئەمە ووتەیەکی باطڵە و هیچ ئەصڵ و ئەساسێکی نیە جگە لە قسەی عەقڵیان چی ترنیە.

## بەڵگەی شەشەم

----------------

الله تعالى دەفەرموێت : **(وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَعْمَالُهُمْ كَسَرَابٍ بِقِيعَةٍ يَحْسَبُهُ الظَّمْآنُ مَاءً حَتَّىٰ إِذَا جَاءَهُ لَمْ يَجِدْهُ شَيْئًا وَوَجَدَ اللَّهَ عِندَهُ فَوَفَّاهُ حِسَابَهُ وَاللَّهُ سَرِيعُ الْحِسَابِ)[سورة النور-٣٩-٤٠]** واته : ئەوانەش کە بێباوەڕ بوون کردەوەکانیان وەکو سەراب تراویلکەی زەویێکی تەخت وایە، خەڵکی تینوو وای دادەنێت کە ئاو، هەتا کاتێک دێت سەر شوێنەکە هیچ شتێک نابینێت، جا لەوێ توشی تۆڵەی خوا دەبێت و حسابی خۆی لە گەڵ دەکات،بەڕاستی لێپرسینەوەی الله خێرا و بە پەلەیە

الله تعالى لەم ئایەتە پیرۆزە دا هەواڵی ئەو نەزانانەمان پێ دەدا لە کۆمەڵەی کوفر و شیرک، کەوادەزانن بەو کوفر و شیرکەیان لە لایەن الله تعالى سودیان پێ دگەیەنێ، الله تعالى لە هیچ شوێنکی قورئان نافەرموێ ئەوانە لە سەر حەقن و پاداشتدراون-یان عوزریان بۆ بهێننەوە، بەڵکو الله تعالى حوکمی داوە لەسەری بە کافر لە گەڵ ئەو بارودخەی،ئەم ئایەتە دەربارەی کافرەکانە کە خەڵک بانگ دەکەن بۆ ئەو باتڵیەی کە خۆیان کە لە سەرین بە خەیاڵی خۆیان وا دەزانن شتێکی چاکیان کردوە لەو بیروباوەڕەی کە هەیانە و بڵاوی دەکەنەوە، بەڵام لە ڕاستی دا شوێن کڵاوی بابردویان کەوتون و هیچ شێکیان نەکردوە، و الله تعالى هیچ عوزرێکی بۆ نەهێناونەتەوەبە نەزانینیان و هەر لەسەرەتای ئایەتەکە بە کافر ناویان دەبا، الله تعالى نمونەی ئەوکەسانەمان بۆ دێنێتەوە وەک نمونەی سەڕابێک کە وەک ئاوێک بەرچاو دەکەوێت کاتێک کەسێک چاوی بەو سەڕابە دەکەوێت و پێویستی بە ئاو هەیە و تینویەتی و وادەزانێ ئاوە دەڕوا بۆ ئەوەی لێی بخواتەوە، کاتێک کە نزیکی دەبێتەوە هیچ نابینێ کافرەکانیش هەر بەو شێوەیە وادەزانێ هەڵساوە بە کارێک و شتێکی بەدەست هێناوە بۆ خۆی، کاتێک گەیشتە لای الله تعالى و پرسیاری لە کردەوەکانی کرد و گفتوگۆی لە گەڵ کرا لە سەری،هیچ شتێکی تێدانەبوو بۆ ئەوەی لێیوەربگیرێت و ئەو نیەت و مەبەستەی بەچاکی دانابوو و نەزانینەکەی عوزری پێ نەدارا.

**بەڵگەی حەفتەم**

---------------

الله تعالى دەفەرموێت : **(رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا)[النساء/٦٥]**

واتە:پێغەمبەرانمان ڕەوانە کردووە کە مژدەدەرن بە ئیماندارن و ترسێنەرن بۆ یاخیەکان، تا خەڵکی هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نەمێنێت لەسەر بێ دینی و یاخی بوونیان دوای ئەوەی خوا پێغەمبەرانی بۆ ڕەوانە کردوون، بێگومان هەمیشەو بەردەوام خوا باڵادەست و دانایە.

ئەم ئایەتەش لە ڕونترین بەڵگەکانە کە الله تعالى قەبوڵی عوزری نەزانین ناکا لە پاش ئەوەی پەیامەکەی نارد و کتێبەکەی دابەزاند و بەندەکانی اقامە حوجە کرد بە قوڕئان، هەر کەسێک ئەو پەیامەی پێگەیشت وە قوڕئانی پێ گەشت، ئەو کەسە اقامە حوجە کراوە، وە لەپاش ئەوە هیچ عوزرێکی نامێنێ هەر وەک و الله تعالى دەفەرموێت**(لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا)**، جا الله تعالى کتێبەکەی دابەزاند و پێغەمبەرەکەی ڕەوانە کرد بۆ ئەوەی خاوەن عوزر عوزری نەمێنێ هەر وەک الله تعالى دەفەرموێت : **(وَلَوْ أَنَّا أَهْلَكْنَاهُم بِعَذَابٍ مِّن قَبْلِهِ لَقَالُوا رَبَّنَا لَوْلَا أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا فَنَتَّبِعَ آيَاتِكَ مِن قَبْلِ أَن نَّذِلَّ وَنَخْزَىٰ )[طه-١٣٤]**

واتە:- ئەگەر ئێمەش پێش ناردنی قورئان و پێغەمبەر لەناومان ببردنایە، ئەوە دەیانوت: پەروەردگارا، بۆچی پێغەمبەرێکت بۆ ڕەوانە نەکردین، تا شوێنی بەرنامە و ئایەتەکانی تۆ بکەوین پێش ئەوەی زەلیل و ڕیسوا ببین.

## بەڵگەڵی هەشتەم

-----------------

الله تعالی هەواڵمان پێ دەدات دەربارەی هود علیه سلام کە بە گەلەکەی خۆی ووت : **(يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا مُفْتَرُونَ)[هود/٥٠]**

واتە: ئەی گەلەکەم خودا بپەرستن لەو خودایە زیاتر هیچ خودایەکتان نییە، بەڕاستی ئێوە تەنها لەو کەسانەن کە درۆ هەڵدەبەستن.

بە درۆزن وقسە هەڵبەستەر حوکمیان لەسەردرا بەر لەوەی بۆیان ڕوونبکاتەوە بە جیاوازی و شیرکەکەیان لەو زەمەنەیان دا، بەڵکو ناوی موشریک لەسەریان جێگیر بوە بەر لەوەی حوجەکەیان پێ بگات، هەر وەک و جێگیر بووە پاش گەیشتنی حوجە، الله تعالی ناوی هێنان بە موشریک و درۆ هەڵبەستەر بەر لەوەی هەواڵیان پێ بگات و وە پاش ئەوەی هەواڵیشیان پێ بگات، پێش هاتنی پێغەمبەر بۆیان وە لەپاش هاتنیش حوکمی شیرک لەسەریان جێگیر بوە، هەر وەک و ووتەی شیخی ئیسلام ئیبن تیمیە-ڕەحمەتی الله تعالی لێ بێت، وە الله تعالی دەربارەی ئەوانەی درۆ بە ناوی الله هەڵدەبەستن دەفەرموێ : **(وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِآيَاتِهِ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ)**واتە : دەبێ کێ لەو کەسە زاڵمتر بێت کە درۆ لەسەر خودا هەڵدەبەستێت یان بەڵگەو نیشانەکانی بەدرۆدێنێتەوە،بەڕاستی خودا زاڵمان سەرفراز ناکا.، کێ هەیە زاڵمتر زاڵمترینیانە ئەوانەی نەزانن و هیچ بەڵگەیەکیان نیە ئیدی دەست دەدەنە قسە هەڵبەستن کەوا کافرانش هەر لەو زاڵمانەنە**(وَالْكَافِرُونَ هُمُ الظَّالِمُونَ)**

## بەڵگەی نۆیەم

--------------

الله تعالی باسی موسا علیه سلام ـمان بۆ دەکات و حوکم لەسەر فیرعەون دەدات بە طاغوت و کافر و زاڵم و خەراپەکار بەر لەوەی موسا علیه سلام ـیان بۆ بنێرێت بەر لەوەی حوجەیان

پێ بگات هەر وەک و دەفەرموێت: **(اذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَىٰ)[النازعات/١٧]** واتە : بڕۆ بۆ لای فیرعەون بەڕاستی ئەو طغیانی کردوە

**(وَإِذْ نَادَىٰ رَبُّكَ مُوسَىٰ أَنِ ائْتِ الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ)[الشعراء/١٠]**واتە : کاتێک پەروەردگاری تۆ بانگی موسای کرد کە بچێت بۆ لای گەلی ستەمکار

**( إِنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ)[القصص/٤]**واتە : بەڕاستی ئەو لەخەراپەکاران بوو

جا هەرکەسێ بێت بەر لە گەشتنی حوجە بێت یان پاش، کەوتە نێو هەر کوفر و شیرکێکەوە ئەوە کوفر و شیرکەکەی لەسەر جێگیر دەبێ.

## بەڵگەی دەیەم

--------------

الله تعالی دەفەرموێت : **(وَمَن يَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ لَا بُرْهَانَ لَهُ بِهِ فَإِنَّمَا حِسَابُهُ عِندَ رَبِّهِ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ)[المؤمنون/١١٧]**

واتە:هەر کەسێک جگە لە خودا هەر پەرستراوێکی تر بپەرستێت، بەبێ ئەوەی لەبارەیەوە هیچ بەڵگەیک و پێ سەلماندنێکی پێ بێت، جا بەڕاستی ئەوە لێپرسینەوەی لەلای پەروەردگاریەتی، بەڕاستی خودا کافران ئازاد و سەرفراز ناکات.

جا الله تعالی لێرەدا حوکمی بەسەر گشت کەسێ دا کەوا جگە لە الله تعالی هەر کەسێک و شتێک بپەرستێت و بیکاتە شەریکی، وە لله تعالی ناوی هێنان بە کافر، وە ڕونی کردەوە کەوا بێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکیان هەبێ کەوتونەتە دوای شتانێک و بە چاکی دەزانن و لە گەڵ الله تعالی دا داوای لێ دەکەن  ئەو ناوهێنانەش لەلایەن ئێمەوە نیە بەڵکو لەلایەن الله و رسولەکەیەوە جا چۆن کەسێ کە عیبادەت لە بۆ غیری الله دەکات، کەوا عیبادەت تایبەت و حەق بە الله ـیە چۆن خاوەن ئەو کارە موسڵمانە؟، الله تعالی لێرەدا زۆر بەڕونی بە گشتگیری

حوکمی لەسەر گشت کەسێ داوە کەوا بکەوێتە نێو شیرکەوە نەوەک جیاوازی دروست بکات لە حوکم لەنێوانیان لە بەینی عالم و جاهیل، لەبەینی کەسی عیناد و کەسی مقلد.

---

## بەڵگەی یازدەم

---------------

الله تعالى دەفەرموێت : **(وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَنفَعُهُمْ وَلَا يَضُرُّهُمْ وَكَانَ الْكَافِرُ عَلَىٰ رَبِّهِ ظَهِيرًا)[الفرقان/٥٥]**واتە : جگە لە خودا ئەو شتانە دەپەرستن کە هیچ سودێکیان پێ نادات و هیچ زیانێکیان پێ ناگەیەنێت، کافرانش هەمیشە پشتیوانی یەکترن بۆ دژایەتی کردنی خودا.

ئەمە دوبارە بونەوەیەکی بەسوودە و تەئکید لێکراوەیەکی ڕوونە، ئەمە لە قورئان دا زۆرە بۆ ئەو کەسەی لە کەلامی رب العالمین وورد ببێتەوە، کەوا الله تعالى ناوی هێنان بە کافر لەبەر پەرستن و دوعایان بۆ جگە لەو، الله تعالى لە هیچ شوێنێ جیاوازی نەخستۆتە نێوان حوکمەکانیەوە بەڵکو گشت گیرە بێ ئەوەی عوزر تێیدا بۆ هیچ کەسێ بێنێتەوە، ڕەنگە کەسانێ بڵێن: خۆ ئێمەش دەزانین و ئەو کەسانە بە کافر دادەنێن ئەونەی جگە لە خودا دەپەرستن لە بت پەرستان و شیتان پەرستان و دار و بەرد و ئاگر ... !!! دەڵێین: ڕاستە ئەمانە شیرکن و پەرستنە بۆ جگە لە الله تعالى بەڵام پەرستن هەر نەبەستراوەتەوە بەوانەوە بەڵکو پەرستن وەک و داوا و پاڕانەوە لە قەبر و شێخ ـەکان و کردنیان بە وەسیلە و واسطە، پەرستن وەک و شوێن کەوتنی دەجالێکی بەناو دینی الله تعالى ـوە کەوا دینیان بۆ دەگۆڕێت و دەستکاری دەکا و شوێنی دەکەون و دەیپەرستن و کەسەکەش طاغوتە، پەرستن وەک و دەنگدان و تێوەگلان تێیدا و ڕازی بون و حوکم بۆ بردنەوە و دەنگ پێدانی بۆ یاسا دەستکردە طاغوتیەکان... زۆری تری هاوشێوەی ئەم پەرستنانە بۆ جگە لە الله تعالى کەوا الله تعالى پەرستنی لەبۆ خۆی بە گشت گیری حوکمی لەسەر داون هەرکەسێ بکەوێتە نێویەوە حوکمەکەی بەسەردا جێگیر دەبێ بێ ئەوەی هیچ کامێکیان عوزری بە هیچ جۆرێک بۆ دابنێ و بینتەوە

## بەڵگەی دوازدەم

----------------

الله تعالی دەفەرموێت(**وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ**)[المائدة/٤٤-٤٥-٤٧]

واتە: جا هەر كەسێ دادوەری نەكات بەوەی الله بۆی دابەزاندوە ئائەوانە كافرن

ئەوە ئەو ناوەیە بۆ گشت كەسێ كە حوكم بەوە نەكات كە الله تعالی دایبەزاندوە، الله تعالی حوكمی كوفری بەسەر گشت كەسێ داوە كەوا حوكمی الله دەگۆڕێت و شوێن یاسا و حوكمێكی غیری شریعەتی الله دەكەوێ و جێبەجێی دەكات، جا ئەم حوكمە گشتگیرە بۆ گشت كەسێ كەوا حوجەكەی پێگەیشتوە یان نەگەیشتوە، زانیویەتی یان نەیزانیوە، الله تعالی بە گشتی حوكم دەدات لێرەدا و لەو ئایەتانەی پێش ئەمە و گشت حوكمەكانی كوفر الله تعالی بە گشت گیری حوكم دەدات لەسەری، ئەو حوكمانەی هەندێكیان ناگرێتەوە و عوزری پێ داون الله تعالی خۆی ڕونی كردۆتەوە نمونە دەفەرموێت : (**مَن كَفَرَ بِاللَّهِ مِن بَعْدِ إِيمَانِهِ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالْإِيمَانِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِالْكُفْرِ صَدْرًا فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِّنَ اللَّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ**)واتە : هەركێ بێباوەڕی نواند بەالله لە پاش ئەوەی ئیمانی هێنابوو، مەگەر كەسێ ناچار كرابێت، بەڵام دڵیشی هەر جێگیر بێت بە باوەڕهێنانەكەی خۆی، بەڵام هەركەسێ دڵی خۆی كردەوە بە بێباوەڕی كوفرەوە، ئەوە ئەوانە ڕق و قینی الله ـیان لەسەرە وسزایەكی گەورەشیان بۆ هەی.، جا سەیری كەن الله تعالی گەر عوزری بۆ كەسی جاهیل دانابێ ئەوە ڕونی دەكردەوە لەپاش حوكم دان بە كوفر بەڵام الله تعالی لەم ئایەتانەدا ئەوانەی باسمان و كرد و دێینە سەری گشتی بە گشتگیری حوكم دەدات و عوزری بۆ جاهیل نەهێناوەتەوە تێیدا.

## بەڵگەی سێزەم

----------------

الله تعالی دەفەرموێت : (**وَإِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً قَالُوا وَجَدْنَا عَلَيْهَا آبَاءَنَا وَاللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا قُلْ إِنَّ اللَّهَ لَا يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاءِ أَتَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ**)[الاعراف/٢٨]

واته:کاتێک که کارێکی خراپ دەکەن دەڵێن: خوا فەرمانی پێکردوین و باوانەکانی خۆشمان هەروا دیون و هەروایان کردووە، ئەی محمد پێیان بڵێ بەڕاستی خودا فەرمان ناکات بەکاری خراپە جا ئایا ئێوە شتێک لەسەر خودا دەڵێن کە هیچی لەبارەوە نازانن؟.،

الله تعالی کردەوەی موشریکانی ناونا فاحیشە و خراپەکاری بەر لەوەی حوجەیان پێ بگات بەبێ ئەوەی عوزریان بۆ بێنێتەوە بە نەزانینیان و تەقلیدیان و شوێنکەوتنی باو باپیرانیان، لە گەڵ ئەوەشدا طەوافی بەیتیان دەکرد و نیەتێکی چاکیان هەبوو لەو کارەیان دا و بە هیدایەت و بەڵگەبون دەیانزانی کەوا بە ڕوتی طەوافیان دەکرد، بەڵام الله تعالی عوزری بۆ نەهێنانەوە لە گەڵ ئەو مەبەستەی زۆر بەچاکیان دەزانی و دەیانکرد.

## بەڵگەی چواردەم

-----------------

الله تعالی دەفەرموێت: **(وَاذْكُرُوهُ كَمَا هَدَاكُمْ وَإِن كُنتُم مِّن قَبْلِهِ لَمِنَ الضَّالِّينَ)[البقرة/١٩٨]**

واته: یادی بکەنەوە هەر وەک و هیدایەتی داون، بەڕاستی پێشتر ئێوە گومڕا بوون

الله تعالی بە گومڕا ناوی بردن بەر لەوەی هیدایەت وەرگرن و حوجەیان بۆ بێت، ئەم ئایەتەش هەر دەربارەی ئەوانە دابەزیوە کە لەبەڵگەی پێشتر باسمان کرد کە حەجیماڵی الله دەکەن و ئەمریان پێ دەکات بە یادکردنەوەی خۆی، ئەوەشیان بیر دەینتەوە کەوا پێشتر چۆن گومڕا بوون، نەوەک بۆیان پەردە پۆش بکرێ لەو کاتیان و بە خاوەن عوزر ناویان بێنێ، بەڵکو ناوی بکەری کارەکان لەسەریان جێگیر بووە، ئەمانە گشتی بەڵگەن لە سەر جێگیر بونی ناوی شیرک و کوفر لەسەر بکەرەکەی بەر لەوەی پەیامی الله ـیان پێ بگات.

## بەڵگەی پازدە

--------------

الله تعالى دەفەرموێت : (وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ قَالُوا إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ-أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْمُفْسِدُونَ وَلَٰكِن لَّا يَشْعُرُونَ)[البقرة/١١-١٢]

واتە: ئەگەر پێشیان بگووترێت: خەراپەکاری مەکەن لەسەر زوی، دەڵێن: بەڵکو ئێمە لە چاکەکارانین- ئاگاداربە هەرئەوانەنە لە خەراپەکارانن، بەڵام هەستی پێناکەن.

سبحان الله- الله تعالى لێرەدا زۆر بە ڕونی باسی ئەو مونافقانەمان بۆ دەکات کاتێ پێیان دەڵێن خەراپەکاری مەکەن دەڵێن نا ئێمە لە چاکە کارانین، بەخۆیان نازانن و نەزانن وادەزانن لەسەر چاکە کارین هەر وەک الله تعالى لە کۆتایی دا فەرموێ(وَلَٰكِن لَّا يَشْعُرُونَ)بەڵام ئەمانە هەست بە خۆیان ناکەن، جا ئەمانە نەزان بون و خەریکی خراپە کاری بوون الله تعالى عوزری بۆ نەهێنانەوە، بەڵکو فەرموی(أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْمُفْسِدُونَ) ئا هەر ئەوانەنە کە خەراپەکارن، الله تعالى بکەرەکەی عوزری پێ نەدا بەڵکو کارەکەی لەسەر جێگیرکردن، جا ئەمە حاڵی کەسانێ بێ لەبەر خەراپەکاری وا توند بێ لەسەریان ، جا چ حاڵی کەسانێک کەوا کەوتونەتە نێو کوفر شیرک- الله تعالى پەنامان بدات

## بەڵگەی شازدە

----------------

الله تعالى دەفەرموێت : (وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ آمِنُوا كَمَا آمَنَ النَّاسُ قَالُوا أَنُؤْمِنُ كَمَا آمَنَ السُّفَهَاءُ أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ السُّفَهَاءُ وَلَٰكِن لَّا يَعْلَمُونَ)[البقرة/١٣]

واتە: ئەگەر پێیان بگوترێت: باوەڕبێنن هەروەکو چۆن خەڵکی باوەڕیان هێناوە، دەڵێن: ئایا ئێمە باوەڕبێنین وەک و باوەڕهێنانی گێلەکان؟، جا بزانن ئەوانە هەرخۆیان گێلن، بەڵام بە خۆیان نازنن.،

ئەم ئایەتە تەواو کەری بەڵگەی پازدەم بوو بەڵام بۆ زیاتر وورد بونەوە و ڕون بون بۆ خوێنەر جودام کردەوە الله تعالی لێرەشدا هەر باسی ئەوانە دەکات و دەفەرموێت کاتێ پێیان دەڵێی ئیمان بێنن، دەڵێن ئیمان بێنین وەک و ئەو گێلانەی ئیمانیان هێناوە، جا ئەوانە نەزان بونە بە حەق وە پێیان وابوە خۆیان لەسەر حەقن و موسڵمانان لەسەر گومراییین و گێلن ئەوانەی شوێنی کەوتونە هەر وەک و الله لە کۆتایی ئایەتەکەدا فەرمووی**(وَلَٰكِن لَّا يَعْلَمُونَ)** بەڵام ئەوانە نەزانن بە خۆیان، جا الله تعالی لە گەڵ ئەو نەزانین و تێکەڵ بونی حەق و باطڵ لێیان و نەپێکانیان عوزری بۆ نەهێنانەوە، بەڵکو فەرموی**(أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ السُّفَهَاءُ)** جا بەڕاستی هەر ئەوانەنە کەوا گێلن، وەک ئەوەی ئەو نەزانانە موسڵمانانیان بە گومڕا و سەرلێشێواو دەدیت ئەوانەی شوێنی دەکەوتن بە گێلیان دەزانی بەڵام الله تەئکیدی لەسەر گێلی ئەوانە کردەوە کەوا لەسەر شیرک و گومڕاییین ـە بێ ئەوەی هیچ عوزرێک بۆ ئەوانە بێنێتەوە کردارەکانیانی لەسەر جێگیر کردن لە گەڵ ئەوەی نەزان بون.

## بەڵگەی حەڤدە

---------------

الله تعالی دەفەرموێت : **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ وَلَا تَجْهَرُوا لَهُ بِالْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَالُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ)[الحجرات/٢]**

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە، دەنگتان بەسەر دەنگی پێغەمبەردا بەرز مەکەنەوە و بەدەنگی بەرز لەگەڵی دا مەدوێن، وەک ئەو دەنگ بەرزیەی کە هەندێکتان لە گەڵ هەندێکتان قسەی پێ دەکەن، نەوەک ببێتە هۆی پوچەڵ بونەوەی کردەوەکانتان کەوا ئێوە هەستی پێ نەکەن.،

بەڵگەیەکی زۆر ڕوونە دەربارەی عوزر نەبونی ئەوانەی بە نەزانی دەکەونە نێو کوفرەوە و هەستیش بەخۆیان ناکەن،جا الله تعالی لێرەدا ئاگادارمان دەکاتەوە بە دەنگ بەرز کردنەوە بەسەر دەنگی رسول الله، نەوەک کارەکانمان پوچەڵ ببێتەوە و هەستیشی پێ نەکەین، جا هیچ

کەسێ کارەکانی بە گشتی وەک ئەمە پوچەڵ نابێتەوە جگە لە کەسی کافر، هەر وەک و الله تعالی دەفەرموێت : **(وَمَن يَكْفُرْ بِالْإِيمَانِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُ)[المائدة/٥]** واتە: جا هەرکەسێ کافر بێت بەو ئیمان ئەوە بەڕاستی کردەوەکانی پوچەڵ دەبێتەوە، وە دەفەرموێت **: (لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ)[زمر/٦٥]** واتە : گەر شیرکت کرد کارەکانت پوچەڵ دەبێتەوە، وەدەفەرموێت : **( وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُولَٰئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ)[البقرة/٢١٧]**واتە: جا هەرکەسێ لە ئێوە هەڵگەڕێتەوە لە دینەکەی و بمرێت ئەوە کردەوەکانی پوچەڵ دەبێت و هەڵدەوەشێتەوە.، جا بۆمان ڕوون بویەوە کەوا هیچ کەسێ کردەوەکانی هەڵناوەشێتەوە بەگشتی تەنها بە کوفر نەبێت

ئیبن تیمیە دەربارەی ئەو ئایەتە دەڵێت: ئەمە ئاشکرایە کردەوەکان هەڵناوەشێنەوە بەهیچ شتێ جگە لە کوفر، لەبەر ئەوەی هەرکەسێ لە سەر ئیمان بمرێت ئەوەهەر دەچێتە بەهەشتەوە، وە دەردەچێ لە ئاگر گەر چوبێ، وە ئەگەر کردەوەکانی گشتی پوچەڵ ببتەوە ناچێتە بەهەشت قەت، وە کردەوەکانیش پوچەڵ نابنەوە مەگەر بەوە نەبێ کە قەدەغەی لێ کراوە، وە ڕەتناکرێتەوە هیچ کردەوەیەک بە موطلقی تەنها بە کوفر نەبێ، هەر وەک و ئەوە زانراوە لە بنچینەی ئەهلی سوننە، بەڵێ بەشێکی کردەوەکان هەڵدەوەشێنەوە بە خراپ کردنی وەک و الله تعالی دەفەرموێت : **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُبْطِلُوا صَدَقَاتِكُم بِالْمَنِّ وَالْأَذَىٰ)[البقرة/٢٦٤]** وە هەر لەبەر ئەمە الله تعالی کردەوەکان بە گشتی پوجەڵ ناکاتەوە تەنها بە کوفر نەبێت[صارم المسلول/ص٥٤-٥٦]

جا الله تعالی ئاگاداری ئیمانداران دەکاتەوە کەوا دەنگیان بەرز نەکەنەوە، لەبەر ئەوەی پێی کافر دەبن گەر هەستیشی پێنەکەن و نەیزانن عوزریان بۆ نیە،جا ئەمە بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرایە بۆ هەرکەسێ کە کەوتبێتە ناو کوفر و شیرکێکەوە و هەست بەخۆی نەکات و نەزان بێت پێی یان مەبەستی ئەوە نەبێت کە کردویەتی عوزر بۆ هیچ کامێکیان نیە هەر وەک و الله تعالی لەم ئایەتەدا ئاگاداری کردینە و ڕونی کردەوە بۆمان.

**بەڵگەی هەژدە**

---------------

الله تعالى دەفەرموێت : **(يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَىٰ شَيْءٍ أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْكَاذِبُونَ)[المجادلة/١٨]**

واتە:ئەو ڕۆژەی کە خودا هەمووان زیندوودەکاتەوە دەکاتەوە، سوێند بۆ خودا دەخۆن هەر وەک و چۆن سوێند بۆ ئێوە دەخۆن و پێیان وایە ئەوان لەسەر بیروباوەڕێکن، جا ئاگادار بن و بزانن ئەوانە درۆزنەکانن.، ابن کثیر لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت: سوێن دەخون بە الله کەوا لە سەر ڕێگای ڕاست و هیدایەت بونە و جێگیر بونە لەسەری، وەک چۆن لە دونیا بۆ خەڵکی سوێندیان دەخوادر، لەبەر ئەوەی هەرکەسێ لەدونیا لە سەر هەرشتێک ژیابێ و مردبێ لەسەر ئەوەش زیندوو دەکرێتەوە، وا دەزانن ئەو سوێند خواردنەیان لەلای الله تعالى سودیان پێ دەگەیەنێ وەک لە دونیا لای خەڵکی سودیان لێی وەرگرت، بیانویان دەهینایە و چاوپۆشیان لێ دەکرا و باوەڕیان پێ دەهینان.

کەسانێک کەوایان دەزانی لەسەر شتێکن و دەستیان بە شتێکەوە گرتوە لەسەرەنجاما بێ ئەمەل و دۆڕاویان ناکات و بە حیسابی خۆیان لەسەر هیدایەت بون و سوێند دەخۆن لەلای الله تعالى کەوا لەسەر شتێ بونە هەروەک و لە دونیا سوێند بۆ ئێمە دەخۆن و دەیانبینین بانگەشەی شیرک وگومڕایی دەکەن لەپەنا توحید، بەڵام الله تعالى ئەو مەبەست و کارانەی کردبویان و ئەو عوزرەی بۆ خۆیان دەهێنایەوە لێیانی قەبوڵ نەکرد بەڵکو بە درۆزن ناوی بردن، درۆزنن کەوا بە حیسابی خۆیان لەسەر هیدایەتن و بانگەشەی بۆ دەکەن بەڵام لەڕاستی دا درۆیە، جا هەروەک و ابن کثیر زۆر جوان باسی لە سوێندەکانیان دەکات کەوا ئەو سوێندەی لەلای خەڵکی دەیانخوارد و بیانوانەی بۆ خۆیانیان دەهێنایەوە لەلای الله تعالى ـیش دەیهێننەوە بەڵام ئەوەی خەڵکی بە عقڵ و سۆزی خۆیانەوە وەری دەگرن، الله تعالى هیچ عوزرێکیان لێ وەرناگرێت ئەگەر چی لەسەر کارێکیش بن و مەبەستیان پێی چاکە بێت و نەزان بوبن بە حەق، هەر وەک و الله تعالى باسی ئەوانەی بۆ کردین و نەفی عوزر بەجەهلی کردن.

## بەڵگەی نۆزدە

--------------

الله تعالى دەفەرموێت : **(ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ عَمِلُوا السُّوءَ بِجَهَالَةٍ ثُمَّ تَابُوا مِن بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا إِنَّ رَبَّكَ مِن بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ)[النحل/١١٩]**

واتە: ئینجا بەڕاستی پەروەردگاری تۆ دەربارەی ئەوانەی کە بە نەزانی خەراپەکاریان کردووەو پاشان لەدوای ئەوە پەشیمان بونەتەوە و چاکە کاریان کردووە، ئەوا بەڕاستی پەروەردگاری تۆ لە دوای ئەو چاکەکردنەی ئەوان لێبوردە و خاوەن بەزەییە پێیان.،

جا الله تعالى کردەوەکانی ناو نا کردەوەی خراپە، وە دەربارەیان بە جاهیل وەسفی کردن، جا بەڕاستی سیفاتی کردارەکانیان لە سەر ناگۆڕێت چیان کردبێت سیفاتی ئەو کارە جێگیر دەبێت لەسەر خاوەنەکەی گەر چی بە نەزانیش کردبیان خەراپە هەر خەراپەیە گەر بە نەزانی بێت یان بە زانین، شیرکیش موشریکە خاوەنەکەی سیفاتی کردارەکەیان لە سەرناگۆڕێت بەڵکو لەسەریان جێگیر دەبێ تا ئەو کاتەی دەگەڕێنەوە لای رب العالمین، جا الله تعالى هیچ عوزرێک بە نەزانینیانی نەهێنایەوە بەڵکو کردارەکانیان چی بوو بەوە وەسفی کردن و ناوی بردن وە لە گەڵ ئەو نەزانینەشیان هیچ عوزرێکی پێ نەدان کەوا لێیان خۆشبێت یان کردەوەکانیان بە مەبەستە چاکەکانیان وەربگرێت نا، بەڵکو الله تعالى دەفەرموێ(ثُمَّ تَابُوا مِن بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا إِنَّ رَبَّكَ مِن بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ) جا کە گەڕانەوە لەپاش ئەو جەهالەتەیان و دەستیان کرد بەکار و کردەوەی چاکە ئەو کاتە الله تعالى لێیان خۆش دەبێت و غفور و رحیم ـە، الله تعالى بە نەزانی لە هیچ کەسێ عوزری پێنادات و لێی قەبوڵ ناکات تەنها دەبێ بگەڕێتەوە بۆ لای رب العالمین و بە تەنهایی بیپەرستێ و کافر بێت بە گشت پەرستراوەکانی دی.

## بەڵگەی بیست

---------------

الله تعالى دەفەرموێت : **(قُلْ أَفَغَيْرَ اللَّهِ تَأْمُرُونِّي أَعْبُدُ أَيُّهَا الْجَاهِلُونَ-وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ-بَلِ اللَّهَ فَاعْبُدْ وَكُن مِّنَ الشَّاكِرِينَ)[الزمر/٦٤-٦٦]**

واتە:بڵێ: جا ئەی نەزانەکان داوام لێ دەکەن جگە لە خودا شتی تر بپەرستم؟- بە دڵنیاییشەوە پەیامانکرد بۆ تۆ و ئەو پێغەمبەرانەی پێش تۆش، بەوەی گەر هات و هاوبەش بۆ خودا دابنێی ئەوە کردەوەکانت هەڵدەوەشێننەوە و لە زەرەرمەندان دەبی-بەڵکو تەنها خوا بپەرستە و لەسوپاسگوزاران بە.،

جا پەرستش کردن بۆ جگە لە الله تعالى شیرکە،وە ئەو کەسەشی بانگەشە و فەرمانی بۆ دەکات شیرکە، وە لەگەڵ ئەوەشدا الله تعالى وەسفی ئەوانەی بە نەزانان کردووە بە شیرەککردنیان، هیچ عوزرێکی بە نەزانینی پێ نەدان، بەڵکو رسول الله ـش ئاگادار دەکاتەوە بەوەی لە گەڵ ئەو نەزانانە هەرکارێکی شیرک ئەنجام بدات کردەوەکانی هەڵدەوەشێتەوە و وەک و ئەوانی لێ دێ، جا ئەمە بۆ رسول الله چاکترین بەندەی رب العالمين عوزری پێ نەدرێت گەر کەوتە نێو شیرکەوە ڕاستەخۆ بەسەری دا جێگیر بێ و کردەوەکانی هەڵبوەشێنێتەوە و دەری بێنێ لە دین ئەی چی کەسانی پاش ئەو؟! جا هیچ کەس عوزری نیە بۆ هەرکارێکی کوفر و شیرک کە بیکات جا بە زانین بێت یان نەزانین. **(وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ)[الزمر/٦٧]** واتە:ڕێزی خودایان نەگرت ڕێزگرتنێکی شایستە بەخۆی، هەمو زەویش لەژێر دەستی ئەودایەلە ڕۆژی دواییدا، ئاسمانەکانیش لولدراون لەلای ڕاستیەوە پاکی و بەرزی بۆ ئەو خودایەی لەوەی کە هاوبەشی بۆ دادەنێن.،

## بەڵگەی بیست و یەک

-----------------------

الله تعالی دەفەرموێت : **(سَيَقُولُ الَّذِينَ أَشْرَكُوا لَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا أَشْرَكْنَا وَلَا آبَاؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن شَيْءٍ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ حَتَّىٰ ذَاقُوا بَأْسَنَا قُلْ هَلْ عِندَكُم مِّنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَا إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَإِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَخْرُصُونَ)[الأنعام/١٤٨]**

واتە:جا موشریکان دەڵێن: گەر خودا ویستی لەسەر بایە ئەوە نە ئێمە و نەباوانەکانمان شیرکمان نەدەکرد و هیچمان لە خۆمان قەدەغە نەدەکرد، ئەوانەی لەپێش ئەوانەشەوە بوون بە هەمان شێوەبون، تا ئەو کاتەی توند و تیژیەکەی ئێمەیان چەشت- پێیان بڵێ ئایا هیچ زانستێکت لایە؟ با بۆمانی بێنن! پێیان بڵێ: کە ئەوەی ئەوان شوێنی کەوتوونە تەنها گومانە، و ئەوەشی دەیڵێن تەنها درۆیە.،

جا الله تعالی لێرەدا کەسانێک ناو دەهێنێ و وەسفیان دەکات بە موشریک سیفاتی کردارەکانی لەسەرجێگیر کردون، وە لە گەڵ ئەوەشدا ئەوانە کەسانێک بوون هیچ زانینێکیان نەبوو بەڵکو کەتبونە شوێن گومانەکان، بەڵام الله تعالی بەو نەزانینەشیان هیچ عوزرێکی پێ نەدان(قُلْ فَلِلَّهِ الْحُجَّةُ الْبَالِغَةُ فَلَوْ شَاءَ لَهَدَاكُمْ أَجْمَعِينَ)١٤٩] واتە:بڵێ:بەڵگەی بنبڕ لەلای خودایە، گەر ویستی لەسەر بایە ئەوە ڕێگای هیدایەتی نیشانی هەمووتان دەدا.، جا بەڕاستی سیفاتی کردارەکان بەر لە گەیشتنی حوجە جێگیر دەبێ لە سەر بەندەکان وعوزریان پێنادرێت، هەروەک و الله تعالی تەئکیدی لێی کردۆتەوە.،

## بەڵگەی بیست و دوو

---------------------

الله تعالی دەفەرموێت : **(وَلَقَدْ آتَيْنَا إِبْرَاهِيمَ رُشْدَهُ مِن قَبْلُ وَكُنَّا بِهِ عَالِمِينَ-إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِ مَا هَٰذِهِ التَّمَاثِيلُ الَّتِي أَنتُمْ لَهَا عَاكِفُونَ-قَالُوا وَجَدْنَا آبَاءَنَا لَهَا عَابِدِينَ-قَالَ لَقَدْ كُنتُمْ أَنتُمْ وَآبَاؤُكُمْ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ)[الأنبياء/٥١-٥٤]** واتە: بەدڵنیاییەوە پێشتریش ئیبراهیمان گەیاندە

ژیری وبەهەموو شتێکی ئەویش ئاگادار بوین-کاتێک بە باوک و نەتەوەکەی گووت:ئەم پەیکەرانە چی کە ئێوە لە دەوریاندا دەمێننەوە؟-گووتیان:ئێمە باوانەکانی خۆمان بینیوە، ئەمانەیان دەپەرست-پێی گووتن:بەڕاستی ئێوە باوانەکانیشتان لە گومڕاییەکی ڕووندابون.،

باوکی پێغەمبەر ئیبڕاهیم علیه سلام و گەلەکەی بە تەقلیدی و نەزانی کەوتبونە پەرستنی ئەو بتانە، هیچ زانینێکیان نەبوو تەنها ئەوە بوو دەیان ووت باوانەکانمان وا بینیوە وایان کردوە، لە گەڵ ئەو نەزانینەیان پێغەمبەر ئیبراهیم علیه سلام پێی نەگووتن: ئێوە عوزرتان هەیە نەزانن ئێوە ئاوا و ئاوا...وبیانویان بۆ بێنێتەوە، بەڵکو زۆر بە ڕونی پێی گووتن : **(قَالَ لَقَدْ كُنتُمْ أَنتُمْ وَآبَاؤُكُمْ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ)**بەڕاستی ئێوە و باوانتان لە گومڕاییەکی ڕوون ئاشکرا دابوون- سبحان الله- چۆن کردارەکانان و بیروباوەڕەکەیان گومڕایی بوو ئاواش سیفاتی گومڕایی لەسەر جێگیر کردن و هیچ عوزرێکی پێ نەدان، بەر لەوەی حوجەکەیان پێ بگەیەنێت و بۆیان ڕوون بکاتەوە حوکمی ضال ـی بەسەردا جێگیر کردن، هەر وەک و پاش ئەو ناوهێنان و وەسفکردنەیان کاتێ گەلەکەی پرسیاری قسەکەیان لێی کرد و پێی گووتن : **(قَالَ بَل رَّبُّكُمْ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الَّذِي فَطَرَهُنَّ وَأَنَا عَلَىٰ ذَٰلِكُم مِّنَ الشَّاهِدِينَ)**واتە:بەڵکوو خودای ئێوە پەروەردگاری ئاسمانان و زەوییە، کە بەدیهێناون، منیش لەسەر ئەو قسەیەی کە بەئێوەی دەڵێم لە شاهێدی دەرەکانم.،-جا بەر لەوەی حوجەیان پێ بگات سیفاتی کردارەکانیانی بەسەردا جێگیر کردن، ئەی چۆن بۆ کەسانێ عوزر هەیە کەوا حوجەکەی پێگیشتووە زۆرر بە ئاسانی و لەبەردەستی دایە، جا بەڕاستی ئەمە لە هیچ کات و ساتێک و زەمەنێکدا هیچ کەس عوزری پێ نەدراوە بە زانین و یان نەزانین، بە گەشتنی بە بەڵگە یان نەگەیشتن، بە تێگەیشتن لێی یان تێنەگەیشتن ... گشتی بکەری کارەکە سیفات وناوی کارەکەی بەسەردا جێگیر دەبێ جا هەر چی بێ و عوزریان پێنادرێت.،

**بەڵگەی بیست و سێ**

---------------------

الله تعالى دەفەرموێت : **(اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللَّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا إِلَٰهًا وَاحِدًا لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ)[توبة/٣١]**

واتە:جگە لە خودا عیسای کوڕی مەریەم و شارەزایانی دین و لەخواترسەکانیان کردن بە گەورە و پەروەردگاری خۆیان،فەرمانیشیان پێ نەکرابوو بەوەی تەنها یەکپەرستراو بپەرستن،هیچ پەرستراوێکی تر نیە تەنها ئەونەبێت،پاکی بۆ ئەو خودایەی کە ئەوان هاوبەشی بۆ دادەنێن.،

ئەمەش هاوشێوەی ئایەتەکەی پێشتر کەوا بە تەقلیدی شوێن زانا و لەخواناسەکانیان کەوتبوون و وایان دەزانی کە ئەوان لەسەر حەقن وجاهیل بون بە حەق، هەر وەک و کاتێ حەدی کوڕی حاتەم هاتە لای رسول الله صلى الله عليه وسلم صلیبێکی لەمل بوو ئەمری پێ کرد لەملی بکاتەوە حەدی ووتی: خۆ ئێمە ئەوان ناپەرستین! رسول الله ئەم ئایەتەی بۆ خوێندەوە**(اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللَّهِ)** و فەرموی : گەر ئەوان شتێکتان بۆ حلاڵ بکەن ئێوەش بە حەلاڵی نازانن یان حەڕامی بکەن بە حەڕامی نازانن؟ ووتی:بەڵێ رسول الله ـپێی فەرموو: ئێ ئەوە پەرستن بۆکردنیانە، جا رسول الله بەو مەبەست و ویستەی ئەوان هیچ عوزرێکی بۆ نەهێنانەوە بەڵکو فەرمووی: ئەمە پەرستنە هەروەک و لە ئایەتەکەش الله تعالى فەرموی: ئەوانیانکرد بە پەروەردگار و پەرستراوی خۆیان و بە موشریک ناوی بردن، لە گەڵ ئەوەشدا نمونەی وەک و حەدی کەوا پێی وابوو ئەم کارەی ئەوان دەیکەن لە شوێنکەوتنی ئەو زانا و لەخواترساوانەیان بریتیە لە گوێڕاڵی الله و پێیان وا نەبوو کە ئەو شەخسانە بپەرستن، بەڵام الله تعالى و رسولەکەی بە مەبەستەکەی ئەوانیان نەکرد بەڵکو فەرمووی پەرستویانە و موشریکن و ئەوانیان کردۆتە پەروەردگاری خۆیان، بێ ئەوەی هیچ عوزرێکی پێ بدات

## بڵگەی بیست و چوار

---------------------

الله تعالى دەفەرموێت : **(وَإِذَا قِيلَ لَهُم مَّاذَا أَنزَلَ رَبُّكُمْ قَالُوا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ-لِيَحْمِلُوا أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَمِنْ أَوْزَارِ الَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ أَلَا سَاءَ مَا يَزِرُونَ)[النحل/٢٤-٢٥]**

واتە:گەر پێشیان بگوترێ: خودای ئێوە چی هێناوەتە خوارەوە؟ دەڵێن:ئەفسانەی پێشینەکانە-جا با لە ڕۆژی دوایی باری خۆیان بە تەواوەتی هەڵبگرن و باری ئەوانەش هەڵبگرن کە بەنەزانی گومڕایان دەکەن، بزانن کەوا خراپترین بار هەڵگرتن ئەوەیە کە ئەوان هەڵی دەگرن.،

الله تعالى لێرەدا زۆر بەڕونی حوکمی ئەو کەسانەمان بۆ باس دەکات کە بانگەشەی کوفر دەکەن جا الله تعالى سزای ئەوانەی بە دوو سزا بۆداناون، سزایەکی خۆیان و سزایەکی ئەو کەسانەی کەوا بە نەزانی شوێنیان کەوتوون و گومڕابوون، جا ئەو نەزانە گومڕایانە سزاکەیان تەنها ئەوەیە کە هی خۆیان هەڵدەگرن بەڵام ئەوانەی بانگەشەی کوفر دەکەن هیخۆیان و ئەوانەی شوێنیان دەکەون، هەر وەک و لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ:**(وَلَيَحْمِلُنَّ أَثْقَالَهُمْ وَأَثْقَالاً مَّعَ أَثْقَالِهِمْ)[العنكبوت/١٣]** واتە: باری گوناهـی خۆیان و ئەوانەی شوێنیان کەوتوون و گومڕایان کردون هەڵیدەگرن.، جا الله تعالى عوزری بۆ هیچ کامێکیان نەهێناوەتەوە هەردووکیان ئەو بارەیان لەسەرەو دەبێ هەڵی بگرن بەڵام (أَلَا سَاءَ مَا يَزِرُونَ)ئەوانەی شونکەوترانینە بارەکەیان قورسترە وتوندترە، هیچ کامێکیان عوزری پێ نەدرا بەڵکو تەنها سزای ئەوەیتریان توند ترە و باری قورسترە لە ڕۆژی دوایدا.

**بڵگەی بیست و پێنج**

---------------------

الله تعالی دەفەرموێت : **(وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ الرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُ شَيْطَانًا فَهُوَ لَهُ قَرِينٌ - وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ السَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ - حَتَّىٰ إِذَا جَاءَنَا قَالَ يَا لَيْتَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ بُعْدَ الْمَشْرِقَيْنِ فَبِئْسَ الْقَرِينُ - وَلَن يَنفَعَكُمُ الْيَوْمَ إِذ ظَّلَمْتُمْ أَنَّكُمْ فِي الْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ)[الزخرف/٣٦-٣٩]** واتە: هەر کەسێک خۆی کوێر بکات و بێ ئاگابێ لە یادی خودا، ئەوا شیطانێکی بەسەردا زاڵ دەکەین کە هاو وێنەیە بۆ ئەوکەسە بەردەوام لە گەڵیدایە - جا ئەو شیطانە هاو وێنانەش ئەوانەلە ڕێگای خودالا دەدەن و دەگێڕنەوە، ئەو کەسانەش بۆ خۆیان وای دادەنێن کەوا لەسەر ڕێگەی هیدایەتن - تا کاتێک کە خۆی و هاووێنەکەی دەێن بۆ لای ئێمە بۆ لێپرسینەوە، ئەوە ئەو کەسە دەڵێت: خۆزیا نێوانی من و ئەو بە ئەندازەی نێوانی شوێنی دوو ڕۆژ هەڵاتەکە دەبوو، ئا ئەوە خراپترین هاووێنەیە کە لەگەڵی دایە - جا ئەمڕۆ ئەو قسانە دادتان نادات، چونکە ئێوە ستەمتان کرد بەڕاستی ئێوە هەردووکتان لە سزاکەدا هاوبەشن.،

جا بەڕاستی ئەو هەڵخەڵەتێندراوە کەوا نەزان بوو وای دەزانی لەسەر ڕێگای هیدایەتە**(وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ)** ، وە هاوەڵە شیطانەکەی زانابوو دەیزانی لە سەر چ ڕێگایەکن، جا الله تعالی هەردوو چینی زانا و نەزانی بەیەکەوە وکۆکردەوە لە ڕۆژی دوایی و فەرموی**(أَنَّكُمْ فِي الْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ)** جا بەڕاستی هەردوولایان لە سزادا هاوبەشن، الله تعالی هیچ عوزرێکی بۆ ئەو نەزانە نەهێنایەوە کەوا بە مەبەستێکی چاک و بە ویستێکی چاکەوە کارەکانی دەکرد و پێی وابوو لە سەر هیدایەتە جا ئەو نەزانە لە ڕۆژی دوایی عوزر بۆ خۆی دێنێتەوە، الله تعالی ـش پێی دەفەرموێ**(وَلَن يَنفَعَكُمُ الْيَوْمَ إِذ ظَّلَمْتُمْ أَنَّكُمْ فِي الْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ)**جا ئەمڕۆ ئەو قسانە دادتان نادات، چونکە ئێوە ستەمتان کرد بەڕاستی ئێوە هەردووکتان لە سزاکەدا هاوبەشن.

## بەڵگەی بیست و شەش

-----------------------

الله تعالى دەفەرموێت : **(وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا وَاذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَاءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِ إِخْوَانًا وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ النَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ)[ال عمران/١٠٣]**

واتە:هەموتان بە توندی دەست بگرن بە ئاینی خواوەو پەرت و بڵاو مەبن،یادی ناز و نیعمەتەکانی خوداش بکەن بەسەرتانەوە، کاتێک کە دوژمنی یەکتری بوون دڵەکانی نەرم کردن بە هۆی ناز و نیعمەتەکانیەوە بوون بە برای یەکتری و، لەسەر ڕۆخی چاڵێکی ئاگریش ـبون، جا لەو چاڵە ئاگرە ڕزگاری کردن، ئاوەها خودا بەڵگە و نیشانەکانتان بۆ ڕوون دەکاتەوە، بەو هیوایەی ئێوە ڕێگای ڕاست بگرنە بەر.،

بەر لە هاتنی رسول الله صلى الله عليه وسلم عەڕەب موشریک بوون، وە الله تعالى لەگەڵ ئەو شیرک و خەراپە کاری و دوژمنایەتیەی نێوانیان هیچ عوزرێکی پێ نەدان لە گەڵ ئەوەی حوجەیان پێ نەگەشتبوو، هەر وەک و فەرمووی ئەمانە لەسەر چاڵێکی ئاگرین بوون**(وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ النَّارِ)** جا مردبان لەسەر ئەو حاڵەیان ئەو چاڵە ئاگرینە شوێن و جێگایان بوو بەڵام ئەو کاتەی بەڵگەیان بۆ هات و وەریانگرت ئەوکاتە الله تعالى بە ڕزگاربوو لەو چاڵە ئاگرینە باسیان دەکات**(فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا)** ، لەگەڵ ئەوەی حوجەیان پێ نەگەیشتبوو هیچ عوزرێکی ئەو نەزانین و حوجە نەگەشتنەیان پێ نەدرا، بەڵکو سیفاتی ئەو کردارانەی کردبویان لەسەریان جێگیر بوو، جا هەر کەسێ بکەوێتە نێو هەرکوفر و شیرکێ سیفات وناوی ئەو کارەی بەسەردا جێگیر دەبێ جا حوجەی پێ گەشتبێت یان نەگەشتبێ، هەر وەک و الله تعالى حاڵی ئەمانەی بۆ ڕوون کردینەوە.،

## بەڵگەی بیست و حەفت

------------------------

الله تعالى دەفەرموێت : (**وَكَذَٰلِكَ زَيَّنَ لِكَثِيرٍ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ قَتْلَ أَوْلَادِهِمْ شُرَكَاؤُهُمْ لِيُرْدُوهُمْ وَلِيَلْبِسُوا عَلَيْهِمْ دِينَهُمْ**)[الأنعام/١٣٧] واتە : هەروەها شیطانەکان ڕازاندنەوەیان کرد بۆ زۆرینەی موشریکان، بەوەی منداڵەکانیان بکوژن،بۆ ئەوەی لەناویان بەرن و دینەکەیان لێ بشێوێنن.،

لەو ئایەتەشدا الله تعالى بە دوو جۆر بۆمان ڕوون دەکاتەوە دەربارەی نەبونی عوزری نەزانین

**یەکەم** : الله تعالى ناوی هێنان بە موشریک لە گەڵ ئەوەی حوجە ـشیان پێ نەگەشتبوو، جا عوزری ئەو پێنەگەشتنەیانیشی پێ نەدان، جا چۆن ئەهلی بیدع عوزر بۆ کەسانێ دێننەوە کەوا بە ئاسانترین ڕێگا حوجەکەیان لەبەردەستە و دەتوانن لێی تێبگەن و کاری پێ بکەن.

**دووەم** : الله تعالى فەرموی دەربارەیان کەوا دینیان لێ شێوێندرابوو نەزان بوون و شوێن گومان کەوتبون شوێن کەسانێ کەوتبون کەوا ئەم کارانەیان بۆ ڕازاندبونەوە و بەخۆیان نەزانیە و دینەکەیان لێ شێواندون، لە گەڵ ئەو حاڵ و نەزانینەشیان الله تعالى هیچ عوزرێکی پێ نەدان بەڵکو بە موشریک ناوی بردن.

## بەڵگەی بیست و هەشت

------------------------

الله تعالى دەفەرموێت : (**قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ قَتَلُوا أَوْلَادَهُمْ سَفَهًا بِغَيْرِ عِلْمٍ وَحَرَّمُوا مَا رَزَقَهُمُ اللَّهُ افْتِرَاءً عَلَى اللَّهِ قَدْ ضَلُّوا وَمَا كَانُوا مُهْتَدِينَ**)[الأنعام/١٤٠] واتە : بەدڵنیاییەوە زەرەریان کرد ئەوانەی منداڵەکانی خۆیان کوشتن بە گێلی و نەزانی و قسە هەڵبەستن بەناوی خودا، ئەو بژێوییەی کە خودا پێی دابوون لەسەر خۆیان قەدەغەکرد، و بێگومان ئەوانە گومڕابوون و لەسەر هیدایەت نەبون.،

ئەم ئایەتەش چەند ئایەتێک دوای ئەو ئایەتەی بەڵگەی بیست و حەفتە وە هەر دەربارەی ئەو کۆمەڵانەیە بەڵام بۆ زیاتر ڕون بونەوە بۆ خوێنەر جودام کردەوە

الله تعالی لێرەشدا هەر دەربارەی ئەوانەی کەوا هیچ حوجەیەکیان پێ نەگەیشتبوو و بەنەفامی و نەزانیانەوە منداڵەکانیان دەکوشتن و شوێن موشریکان کەوتبون و الله تعالی بە موشریک و گومڕا ناویان دەبا، جا چۆن بە کەسێ دەگوترێ موسڵمان کەوا کەوتۆتە نێو کوفر و شیرکێکەوە بە نەزانی بێ یان زانین کەوا حوجەشیان پێ گەیشتوە؟ کەوا الله بەو موشریکانەی هەر حوجەشیان پێنەگەیشتوە دەفەرموێ**(قَدْ ضَلُّوا وَمَا كَانُوا مُهْتَدِينَ)**بەڕاستی گومڕا بوون و لەهیدایەت دراوان نەبون، لە موسڵمانان نەبون بەڵکو لە موشریک و گومڕایان، بەڵگەکان زۆرر ڕوونن تەنها پێویستی بە دڵێکی لە خودا ترس و تەسلیم و ملکەچ بۆ فەرمان و بەڵگەکانی رب العالمين.

## بەڵگەی بیست و نۆ

--------------------

الله تعالی دەفەرموێت : **(وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَىٰ شَهِدْنَا أَن تَقُولُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَٰذَا غَافِلِينَ-أَوْ تَقُولُوا إِنَّمَا أَشْرَكَ آبَاؤُنَا مِن قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِّن بَعْدِهِمْ أَفَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ الْمُبْطِلُونَ-وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ الْآيَاتِ وَلَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ)[الأعراف/١٧٢-١٧٤]** واتە : ئەو کاتەش وەبیربێنەوە کە خودا لەپشتی نەوەکانی ئادەم وەچەو نەوەی دەرهێناو شایەدیشی پێدان لەسەرخۆیان، ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟ گووتیان: بەڵێ شایەدیمان دا کە تۆ پەروەردگاری ئێمەی، بۆیە ئەم شایەدیەشمان پێ دان بۆ ئەوەی لە ڕۆژی دوایی نەڵێن ئێمە لەوە بێئاگابوین-بۆ ئەوەی نەشڵێن لەبەر ئەوەی باوانەکانمان پێشتر شەریکیان بۆ خودا دانابوو، و ئێمەش نەوەی ئەوان بووین و لەدوای ئەوان هاتووین و جا ئایا لەناوماندەبەی بەوەی مایەپوچەکان کردویانە- بەم شێوەیە بەڵگە و نیشانەکانی خۆمان ڕوون دەکەینەوە، بە هیوای ئەوەی بگەڕێنەوە.،

لەڕوونترینی بەڵگەکان کەوا الله تعالی بۆمانی ڕوون دەکاتەوە کەوا بەڵێنی توحید و شاهێدی دانپێدانانی پەروەردگارێتی خۆی لێ وەرگرتن، کردی بە حوجە و بەڵگەیەک لەسەریان کەوا بەهۆیەوە عوزری بۆ نەهێشتنەوە بەهیچ یەکێ لە نەزانین و تەقلیدی باوانیان، گشتی نەوەی ئادەم لەسەر سروشتێکی پاک لەدایک دەبێ، و ئەمە بەڵێن و دینەکەیانە جا گەر گۆڕیان و هەڵیان وەشاندەوە ئەوە حوکمی هەڵوەشێنەرەوەکەیان لەسەر جێگیر دەبێ بەبێ سەرنج دانە نەزانینی یان تقلیدی یان عینادی هەروەک و رسول الله دەفەرموێ(هەر منداڵێک کە لەدایک دەبێ لەسەر سروشتێکی پاک لەدایک دەبێ پاشان دایک وباوکیان دەیانکەن بە یهودی و نصرانی یان دەیانکەن بە ئاگرپەرست) ئەو سروشتەش بریتیە لەو شاهێدیەی الله تعالی لە نەوەی ئادەمی وەرگرت لەسەر خۆیان بۆ ئەوەی هیچ عوزرێکیان بەدەستەوە نەهێڵێ، ئەو سروشتەی دان نانیانە بە پەروەردگارێتی رب العالمین هەر وەک و الله تعالی دەفەرموێ:**(وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ)[القمان/٢٥]** واتە : گەر لێیان بپرسی کێ ئاسمانەکان و زەوی درووست کردوە دەڵێن خودا، وەدەفەرموێت : **(قُل لِّمَنِ الْأَرْضُ وَمَن فِيهَا إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ-سَيَقُولُونَ لِلَّهِ)[المؤمنون/٨٤-٨٥]**واتە:زەوی و ئەو کەسانەی کە لەسەری دەژین کێ خاوەنیانە؟ دەڵێن: هەر خودا خاوەنیەتی.، جا ئەو سروشتەی الله تعالی لە کاتی لەدایک بوون بە مرۆڤی بەخشیوە کەوا شاهێدی لەسەرخۆی لێ وەرگرتوە کێ ئاسمانەکان و زەوی درووست کردوە دەڵێن:الله تعالی جا گشتی مرۆڤ درک بەمە دەکات و هەست بە پەروەردگارێ دەکات کەوا درووستکەرە وە گشت ئەندامەکانی جەستە و عقڵی پێ بەخشیوە بۆ ئەوەی بەدوای حەق بێت و هەر ئەو کەسە بپەرستێت کەوا ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لە نێوی دایە درووستی کردوە، جا ئەمە حوجە و بەڵگەیە لەسەر گشت نەوەی ئادەم و حوجەکەی پێ گەشتووە، هەر وەک و ابن القیم دەربارەی ئەو شاهێدیە دەڵێت:(شاهێدی پێدان لەسەر خۆیان کەوا کێ پەروەردگاریانە، وە ئەمە داواکاری دانپێدانانەکەیان بوو بە پەروەردگارێتی، دانپێدانەنەکەیان حوجەکەی گەیاندە سەریان)[احکام اهل ذمة]، جا پاش ئەوەی الله تعالی شاهێدی لێوەرگرتن و حوجەی پێ گەیاندن دەفەرموێ**(أَن تَقُولُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَٰذَا غَافِلِينَ)** بۆ ئەوە ئەو شاهێدیەم لێوەرگرتن بۆ ئەوەی لە ڕۆژی دوایی عوزر بۆ خۆتان نەهێننەوە و بڵێن: ئێمە بێ ئاگاو نەزان بوین بە حەق!،وە پاشان دەفەرموێ**(أَوْ تَقُولُوا**

**إِنَّمَا أَشْرَكَ آبَاؤُنَا مِن قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِّن بَعْدِهِمْ)** یان بڵێن: باوانمان موشریک بوون و ئێمەش نەوەی ئەوان بوین و شوێنیان کەوتین بەتەقلیدی بێ هیچ بەڵگەیەکمان لەدەست بێت شوێن ئەوان کەوتین و نەوەی ئەوان بوین! سبحان الله- الله تعالی ئەو شاهێدیەی کردە بەڵگە لەسەریان لە سەر نەوەی ئادەم بە گشتی کەوا لەڕۆژی دوایی عوزر بۆخۆی نەهێنێتەوە بە نەزانین و تەقلیدی باوانیان چونکی بەڕاستی هیچیان قەبوڵ ناکرێن و الله تعالی بە شاهێدی دانەکەیان عوزری هیچی بۆ نەهێشتنەوە، جا کێ هەیە دوای ئەم بەڵگە ڕوونە بڵێ: کەسێ بکەوێتە ناو کوفر و شیرک نەزان بێت یان بەنەزانی شوێن باوانی کەوتبێ عوزری هەیە نەزانە؟!! **(وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ الْآيَاتِ وَلَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ)** ئەمەش بەڵگە ڕونەکانی الله تعالی ـیە بەوهیوایەی بگەڕێنەوە بۆ لای.

## بەڵگەی سیی

-------------

الله تعالی دەفەرموێت : **(وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا وَمَا لَيْسَ لَهُم بِهِ عِلْمٌ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِن نَّصِيرٍ)[الحج/٧١]** واتە : جگە لە خودا پەرستراوی تر دەپەرستن بێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکیان بۆ هاتبێتە خوارەوە بەبێ ئەوەی هیچ زانیاریەکیان لەم بارەیەوە هەبێت هیچ پشتیوانیکەرێکیش نییە بۆ ستەمکاران.،

بغوی لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت : **(وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا)**واتا بەڵگە**(وَمَا لَيْسَ لَهُم بِهِ عِلْمٌ)**واتا ئەوان کردەوە دەکەن لەگەڵ نەزانینیان نەوەک لە گەڵ زانینیان**(وَمَا لِلظَّالِمِينَ)** بۆ موشریکان(مِن نَّصِيرٍ)ڕێگریەک ڕێگریان بۆبکات لەسزای الله)[ج٥/ص٣٩٩]

وە ابن کثیر لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت : الله تعالی هەواڵی موشریکانمان پێ دەدات لەو نەزانین و کوفرەیان، وە جگە لەپەروەردگار شتانێکیان دەپەرست بێ ئەوە هیچ بەڵگەیەکی

لەسەر دابەزیبێ، واتە:بەڵگە هەر وەک و دەفەرموێت**(وَمَن يَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ لَا بُرْهَانَ لَهُ بِهِ فَإِنَّمَا حِسَابُهُ عِندَ رَبِّهِ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ)[المؤمنون/١١٧]** هەر بۆیەش الله تعالی لێرەدا فەرموی : **(مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا وَمَا لَيْسَ لَهُم بِهِ عِلْمٌ)**واتا هیچ زانستێک و بەڵگەیەکیان لانییە لەوەی جیاوازن و کێشەیان لێ هەیە، بەڵکو ئەو کارەیان پەیوەستە بە باوان و پێشینانیانەوە بێ هیچ دەلیلێک و بەڵگەیەک، وە سەرچاوەکەیان لەوەیە کە شیطان بۆی هێناون و ڕازاندویەتیەوە بۆیان، لەبەر ئەوەیە الله تعالی هەڕەشەیان لێ دەکات و دەفەرموێ**(وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِن نَّصِيرٍ)**واتا هیچ ڕزگارکەرێکیان نیە ڕزگاریان بکات لەلای الله،کاتێ کە تۆڵەیان لێ دەسێنێ و سزایان دەدات)[ج٥/ص٤٥٣]

رازی دەڵێت لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا : **(وَمَا لَيْسَ لَهُم بِهِ عِلْمٌ)** ئەگەر لەسەر هیچ نەبوو واتا بە تەقلید و نەزانی یان لەسەر گومان، گشت ووتەیەکی وایان کەوا مەسەلەکە پوچەڵ دەکاتەوە، لەم ڕووەوە بەڵگەیە کەوا بەڕاستی کافر هەر کافرە، وە ئەگەر نەشزانێ کافر بووە، وەبەهەمان شێوە بەڵگەیە لەسەر خراپێتی لاساییکردنەوە)[ج١١ص١٥١]

لەم ئایەتەدا گەر لێی وورد بینەوە بەڵگەیەکی زۆر ڕونمان دەست دەکەوێت لەسەر نەبونی عوزر بە نەزانین یان بە تەقلید یان کەوتنە گومان، هەر وەک و دەیبینین الله تعالی لێرەدا دەفەرموێت : **(وَمَا لَيْسَ لَهُم بِهِ عِلْمٌ)** واتا هیچ زانست و بەڵگەیەکیان لا نیە و نیتیان کە نەبوو ئێ نەزانن،الله تعالی لەسەرەتادا ئەوەی بۆ ڕوون کردینەوە دەربارەی ئەو کەسانە کەوا لەسەر ئەوەی دەیکەن هیچ بەڵگەیەکیان پێ نەدرایە وە خۆشیان نەزانن، لەکۆتاییشدا کوفر و زوڵمەکەیانی لەسەر جێگیر کرد**(وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِن نَّصِيرٍ)** زوڵم مەبەست لە کوفر و شیرکەکەیانە هەر وەک و بغوي و ابن كثير ئاماژەی بە موشریکان کرد وە الله تعالی دەفەرموێت**(إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ)** بەڕاستی شیرک زوڵمێکی گەورەیە، وەدەفەرموێت **(وَالْكَافِرُونَ هُمُ الظَّالِمُونَ)** بەڕاستی کافران هەر لەزاڵمانن، ئایەتی تر زۆرن کەوا الله تعالی کافر و موشریکان بە زاڵم ناو دەبا، جا لە گەڵ ئەو نەزانینەیان کەوا پەرستنێکیان دەکرد وایان دەزانی هیدایەت لەوەدایە الله تعالی ڕاستەوخۆ حوکمی کردەوەکانیانی بەسەردا جێگیرکردن بێ ئەوەی هیچ عوزرێکیان پێ بدات.

## بەڵگەی سی و یەک

--------------------

الله تعالى دەفەرموێت : **(وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولَٰئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولًا)[الإسراء/٣٦]** واتە : بەسەر شتێكەوە مەوەستێ و قسەی تێدا مەكە، كە هیچ زانیاریەكت لەسەری نەبێت، بیستن و بینین و دڵەكان، بەڕاستی ئەوانە هەمووی بەر پرسیارە لە بەرامبەریەوە.،

الله تعالى لێردە ئاگادارمان دەكاتەوە كەوا بە نەزانی شوێن هیچ نەكەوین و لەسەر هیچ شتێ نەوەستین بەنەزانی، لەبەر ئەوەی گشتی بەرپرسیارە لە هەركارێک دەیكا بە نەزانی بێ یان زانین، هەر لەبەر ئەوە الله تعالى بۆمانی ڕوون كردەوە و تەنها باسی بێ زانستی كرد بە نەزانی كەسێ تێبكەوێ و عوزری نەبێ حەتمەن كەسێ بشزانێ هەروا جەختی لەسەر نەزانین كردۆتەوە بۆ ئەوەی ڕوونبێ بۆمان كەوا هیچ كەسێ معزور نیە بەڵكو گشتی مسئولە.

## بەڵگەی سیی و دوو

--------------------

الله تعالى دەفەرموێت : **(أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَىٰ إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِي مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ كَفَّارٌ)[الزمر/٣]**

واتە:جا بزانن دینی پاک هەر بۆ خودایە، ئەوانەش كە بێجگە لەو بە گەورەو ڕابەری تریان بۆ خۆیان داناوە، دەڵێن: ئێمە بۆیە ئەوانەمان بۆخۆمان داناوە بۆ ئەوەی لە كاتی گەڕانەوەمان لەلای خودامان نزیک بكەنەوە،بەڕاستی خودا لە ڕۆژی دوایدا دادوەری دەكا لە نێوانان دا لەوەی ئەوان تێیدا جیاواز و دووبەرەک بون، بەڕاستی خودا ڕێگەی هیدایەتی خۆی نیشانی ئەو كەسە نادان كە درۆزنێكی كافرە.،

**(أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ)**الله تعالى لەسەرەتادا وەسفی بەندایەتی کردنیکرد بۆ خۆی کەوا دەبێ بە پاکی و بێ شریک بۆ دانان بێت، واتا هیچ عیبادەتێک قەبوڵ نابێ گەر بە پاکی و بێ شیرک ئەنجامی نەدەن، پاشان باسی ئەو موشریکانەمان بۆ دەکات الله دەپەرستن دان بە تاک و تەنهایی الله تعالى دادەنێن، بەڵام تەئویلێکیان کردوە و شتێکیان بۆ خۆیان زیاد کردوە لە بیروباوەڕیان کەوا پێیان وایە پەرستن نیە بەڵکو لە الله تعالى ـشیان نزیک دەکاتەوە و لەسەرهیدایەتن هەر وەک و الله تعالى باسی حاڵی ئەو کەسانەی بۆ کردین**(مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَىٰ)** نازانن ئەو کارەی ئەوان شیرکە و گومڕاییە و بەڵکو پێیان وایە ئەو کارەی دەیکەن لە رب العالمین ـنزیکیان دەکاتەوە و ئەوەی لەسەرینە هیدایەتە، نەزان بوون هەر وەک الله تعالى نەزانینەکەی پێ ڕاگەیاندین پاشان بزانین ئایا لەگەڵ ئەو نەزانینەیان و مەبەست و ویستەی بە چاکە و هیدایەتدانانەیان عوزریان پێ درا؟؟ نەخێر لە گەڵ ئەوەی لە نەزانەکان بوون و بەهەڵە کەوتبونە نێو شیرکەوە و بە هیدایەتیان دەزانی الله تعالى هیچ عوزرێکی پێ نەدان بەڵکو بە کافریان دادەنێت و کارەکەی کردبویان لەسەریان جێگیر کرا وە بە درۆزن ناوی بردن بەوەی شتانێکیان بە نەزانی بە ناوی الله ـوە هەڵبەستوە و پێیان وایە لە لایەن الله تعالى ـوەیە بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا هیچ عوزرێکیان پێ نەدرا، جا ئەم نمونانە رب العالمین بۆیە بۆمان باس دەکات تا وەک و لێی وورد ببینەوە و ببێتە پەند نەوەک ئێمەش بە ناوی الله قسە بۆ الله تعالى هەڵبەستین و بڵێین کەسێ کوفر و شیرک دەکا بەنەزانی عوزری هەیە و عوزری پێ دایە، بەڕاستی زۆرر ترسناکە و لە دین دەرچونە قسە دانە پاڵ الله تعالى کوفرە و لە دین دەرچونە، واجبە لە سەرگشتمان بەڕائەت لە فکر کردنەوەی عقڵی خۆمان وعاطفیەت بێنین بەڵکو پێویستە تەسلیم و پابەند بین بە ئەمر و حوکمەکانی رب العالمین و هیچ شتێ نەدەینە پاڵی و عوزر بۆ جاهیل بێنینەوە حوکمان حوکمی ئەو کەسانە بێت-الله تعالى پەنامان دات

## بەڵگەکانی لە سوننەتـدا

الحمدلله لەپاش دانانی بەشێ لەبەڵگەکانی قوڕئان لەبارەی نەبونی عوزر بۆ کەسی نەزان، ئێستاکە دێینە سەر بەڵگەکان لە سوننەتی رسول الله صلی الله علیه وسلم، لێرەش بە کورتی بیروباوەڕی رسول الله و ئەوەی لە سوننەت دایە ئایا عوزر بۆ کەسی نەزان دەهێندرێتەوە یان عوزری بۆ نیە، دەچینە سەری:

**بەڵگەی یەکەم** : لە ئەبو هوڕەیرەوە(رضي الله عنه)دەڵێت : رسول الله صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی:(داوام کرد لە الله ڕێگام بدات داوای لێ خۆشبون بۆ دایکم بکەم ڕێگای پێم نەدا، تەنها ڕێگای دا سەردانی گۆڕەکەی بکەم)[صحيح المسلم/٩٧٦]

دایکی بەڕێزترین و چاکترین بە ندەی الله تعالی عوزری پێ نەدرێت کەوا لە سەردەمی بەر لە هاتنی رسول الله ــش بووە صلی الله علیه وسلم کەوا بەر لە هاتنی پێغەمبەر مردووە عوزری نەبێت، جا چۆن عوزر بۆ کەسانێ هەیە کەوا قوڕئان و سوننەتی پێگەیشتووە، جا ئەمە بەڵگەیەکی ڕوونە و ئاشکرایە لەبارەی نەبونی عوزر بۆ کەسی نەزان و لیێش هاتنی ئیسلام و لەپاش هاتنی ئیسلامدا.

**بەڵگەی دووەم** : پیاوێک هاتە لای رسول الله صلی الله علیه وسلم ووتی: باوکم لەکوێیە؟ رسول الله فەرمووی: لەناو ئاگرە، پیاوەکە بێتاقەت بوو و ڕۆیشت پاشان رسول الله بانگی پیاوەکەی کردو فەرمووی: باوکی من و باوکی تۆش لە ئاگرن.[سحيح المسلم/٢٠٣]

رسول الله صلی الله علیه وسلم باوکی خۆی و باوکی ئەو کەسە، کەوا پێشتر لەسەردەمی نەزانی بوونە و بەر لەوەی پێغەمبەر بێت و ئیقامە حوجەیان پێ بگات، ئینجا لە گەڵ ئەو حاڵەشیان هەر بە کافر و ئەهلی ئاگر باسی لێوە کردن و عوزری لەبۆ نەهێنانەوە و باسی هیچ عوزرێکی نەکرد بۆیان بەڵکو سزاکەشیان هیچ عوزرێکیان بۆنییە، جا چ حاڵی ئەوانەی قوڕئان و سوننەتیان پێگەیشتوە.!؟

**بەڵگەی سێییەم** : رسول الله صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت:(سێ کار بەدەست هەن، دوویان لە نێو ئاگرن و یەکێکیان لەبەهەشتە، یەکێکیان حەقی ناسیوە و دادوەری پێ دەکا ئەوە لەبەهەشتە، یەکێکی تریان حەقەکەی دەناسێت و دادوەری پێی ناکا ئەوە لە ئاگردایە، وە یەکێکی تریان حەق ناناسێت و بە نەزانین دادوەری لە نێو خەڵکی دەکا ئەوەشیان لە ئاگردایە)[رواه الاربع وصححه الحاكم]

زۆرر ڕوونە بۆ ئەوانەی دڵیان جێگیر بووە بە تەوحید و بۆ ئەوانەی پەردەیان بەسەر دڵ دا نەدراوە، رسول الله زۆر جوان حاڵی ئەوانەمان بۆ ڕووندەکاتەوە ئەوەی کاری پێ دەکا و دەیزانێ لەبەهەشتە و ئەوەی نایزانێ و ئەوەی دەیزانێ کە کاری پێ ناکا لەئاگردایە، رسول الله نەی ووت ئەوەی حەقەکەی نەناسیوە و بەنەزانین دادوەری دەکا عوزری بۆ هەیە نەخێر فەرمووی لەئاگردان، رسول الله صلی الله علیه وسلم نەزان و زانای لە یەک ئاست دا کۆکردەوە هەروەک و لە بەڵگەکانی قوڕئانیشدا باسمان کرد، هیچ لێکدانەوەیەکی ئەهلی باطڵ لەخۆ ناگرێت بەڵکو رسول الله خۆی باسی عوزر بۆ کەسی نەزانمان بۆ دەکات و دەڵێت عوزری بۆ نیە و لەئاگردایە-پەنادەگرین بە الله تعالی لەسزاکەی.

**بەڵگەی چوارەم** : رسول الله صلی الله علیه وسلم دفەرموێت:(الله تعالی ئەم عیلمە هەڵناگرێتەوە لە سینگی پیاوان، بەڵکو ئەم عیلمە هەڵدەگرێتەوە بە نەمانی زانایان، کە زانا نەما خەڵکی سەرانێکی نەزان بۆ خۆی دا دەنێ ئەوجا پرسیاری لێ دەکەن و فەتوایان بۆ ئەدەن بە بێ عیلم گومڕا ئەبن و خەڵکیش گومڕا دەکەن)[صحیح البخاري/١٠٠]

رسول الله صلی الله علیه وسلم زۆر جوان باسی نەمانی علمان بۆ دەکات کاتێ کە خەڵکی توشی نەزانی بوو ئیدی دەکەونە شوێن سەرانێکی نەزانی تر و نەزانن، پاشان ئەوەی پێ ڕاگەیاندین ئەو نەزانانە گومڕان و خەڵکیش گومڕا دەکەن، رسول الله لە گەڵ ئەو نەزانین و نەمانی علمەیان و بە گومڕا ناوی هێنان و سیفاتی کردارەکەی بەسەر دا جێگیر کردن، عوزری بۆ نەهێنانەوە بڵێ ئەوە عوزریان هەیە کە دەکەونە ئەو کارەوە یان وا و...، بەڵکو فەرمووی گومڕانە و خەڵکیش گومڕا دەکەن(فضلوا واضلوا)

**بەڵگەی پێنجەم** : لە عائیشە ـوە(رضي الله عنه) دەڵێ: ووتم: ئەی رسول الله صلی الله علیه وسلم (إبن جدعان)لەسەردەمی نەفامی دا سەردانی کەس و کاری خۆی دەکرد، خواردنی دەدا بە هەژاران، ئایا ئەوە سودی هەبوە بۆی؟ فەرمووی:(نەخێر، سودی پێ ناگەیەنێ چونکی ئەوڕۆژێ نەیوتوە: خودایە لە گوناهەکانم خۆشبە لە قیامەت)[صحیح المسلم/٣٤٧]

لێرەدا رسول الله صلی الله علیه وسلم نەفی عوزری کرد بۆ إبن جدعان کەوا پێشتر لە جەهالەت دابوە و موشریک بووە بەڵام لەگەڵ ئەوەش چاکەی کردیە، ئەو نەزانین و کردەوانەی کردبوی هیچی سودی پێ ناگەیەنێ و نابتە عوزر بۆی لەبەر ئەوەی هیچ کاتێ نەگەڕاوەتەوە لای الله تعالی و داوای لێ خۆشبونی لێ بکا هەر لە سەر کوفر بوە بە نەزانی هەر وەک و دایکە عائیشە باسی حاڵی نەزانینی بۆمان کرد و رسول الله ـش نەفی عوزر لەبۆی.

## ڕونکردنەوە

بەڵگەکانمان لە قورئان و سوننەت دانا لە نەبونی عوزر بۆ نەزان جا دێینە سەرئەو ڕونکردنەوە و دابەشبونە و بەشانەی پەیوەندیان بە بابەتەوە هەیە.

مەسائیلی {أسماء} و {أحكام}

یەکێک لە بابـەتە هەرە گرینگەکان کەوا پێویستە بزاندرێ کەوا بریتیە لە بابەتی ناو و حوکم، کـەوا ئەوانەی عوزر بۆ کافر و موشریک دەهێننەوە تێدا تێکەوتوون و تێکەڵیان کردوە وا دەزانن هەرکەسێ ناوی بە کوفر هات ئیدی حوکمەکەشی دەگرێتەوە..! جا دێینەسەر هەردوو باسەکە ان شاءالله تعالی:

مسائیلی {أسماء}ـناو: بریتیە لە ناوی ئەو کەسانەی کە دەکەونە ناو کارێک و لە نێو چ چوارچێوەک دان وەک: ئیماندار و موسڵمان و کافر و موشریک و مرتد منافق .. هتد لەناوەکانی تر، وە ئەم ناوانەش هیچیان بە بێ بەڵگە ناچەسپێ بەڵکو پێویستە هەموویان بەڵگەی الله تعالی لەسەر هەبێ و بەئاشکرایی دیار بوو ئەوناوەی بەسەرا جێگیر دەبێ، هەروەک و الله تعالی دەفەرموێت : **(وَعَلَّمَ آدَمَ الْأَسْمَاءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلَائِكَةِ فَقَالَ أَنبِئُونِي بِأَسْمَاءِ هَٰؤُلَاءِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ-قَالُوا سُبْحَانَكَ لَا عِلْمَ لَنَا إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَا)[البقرة/٣١]**
واتە : الله ناوی هەموو شتەکانی فێری ئادەم کرد و ئینجا ئەم شتەی نیشانی فریشتەکاندا و ووتی: ئێوە گەر ڕاست دەکەن کە شایستەترن ناوی هەموو ئەو شتانەم پێ ڕابگەیەنن- ووتیان: پاکی بۆتۆ ئێمە هیچ زانینێکمان نیـە مەگەر ئەوەی تۆ فێرت کردبین.، جا الله تعالی لە قورئانەکەی و سوننەتەکەی ناوی گشت شتەکانی بە نەوەی ئادەمی گەیاندووە و تێیدا داناوە بۆ ئەوەی بتوانن شتەکان لە یەک جیابکەنەوە، وە هیچ جیابونەوەیەکیش نابێ ئیـللا دەبێ بەڵـگەی لەسەر بـێت،

مەسائیلی{أحكام}ـ: حوکمەکان لەسەر کەسەکان وەک: کوشتن و سزادان و مارەیی و مردنی و شاردنەوەی و میرات و خۆشەویستی...هتد لە حوکمەکان،

هەر کەسێ ناوندرا کافر مەرج نیە حوکمی کوفری بەسەردا جێگیر بێ وە هەرکەسێکیش ناوندرا موسڵمان مەرج نییە حوکمی موسڵمان وەربگرێ

ئیبن تەیمیە {رحمه الله}دەڵێت : ( بەڕاستی الله تعالی جیاوازی کردووە لە نێوان هاتنی پەیامەکە و پێش هاتنی لە ناو و حوکمەکانیاندا وە کۆیانبکاتەوە لەنێوانیاندا لە ناو و حوکمەکاندا)[مجموع الفتاوی ٣٧/٢٠] وە دەڵێت : (ناوی کەسێک جێگیر دەبێ و نکۆڵیدەکرێ بە پێی حوکمەکە پەیوەست دەبێ پێیەوە، بەڵام واجب نابێت لە جێگیر کردن و نکۆڵیکردنی لە حوکم کەوا وەک و حوکمەکانی تربێت)[مجموع الفتاوی ٧/٤١٨]

هەر وەک و شێخ زۆر جوان و پوخت باسی لێوە کرد جێگیر کردن و نکۆڵی کردنی ناوەکەی بە پێی حوکمی دەبێ بەڵام لە هەموو حاڵەتێک وەک و حوکمەکانی تر جێگیر و نکۆڵی تێدا ناکرێ، کەسێ قوڕئان و سوننەتی پێ نەگەیشتبێت و نەزانە بەحەق ئەو کەسە ناوی کوفری لەسەر جێگیرە بەڵام حوکمەکەی لەسەرجێگیر نابێت تا ئەو کاتەی قوڕئان و سوننەتی پێ دەگات ان شاءالله تعالی دێینە سەر ئەمانەش بەڕوونی

نمونە وەک و کەسی مونافیق ناوی ئیسلامی لەسەر جێگیـرە و نوێژی لەسەر دەکرێ ولە گۆڕستانی موسڵمانان دەنێژرێت وە حەقی میراتیشی پێ دەدرێت، بەڵام حوکمەکەی لە ئاخیرەت دا لە لە خوار خوارەوەی ئاگردان و بۆ هەتاهەتایە

وە نمونە ئەهلی فیترە کەوا بەهیچ شێوەیەک پەیامێک و پێغەمبەرێکیان بۆنەهاتوە لە دوونیادا ناوی کوفریان بەسەردا جێگیر دەبێ وە حوکمیشیان لە لای الله ـیە کەوا سزایان نادات، وە تاقیدەکرێنەوە

هەروەک و شێخ ئیسحاقی کوڕی عبدالرحمن{رحمه الله}ئیجماع نەقڵ دەکات و دەڵێت:( وە ئەهلی فیترە ئەوانەی پەیامیان پێنەگەیشتوە وە قوڕئان وەمردون لە سەر نەزانی بە موسڵمان ناوناهێندرێن بە ئیجماع وە داوای لێ خۆش بونیشیان بۆ ناکرێت، بەڵام جیاوازیەکەی ئەهلی علم لە سزادانیانە لە کۆتاییدا)[عقیدة الموحدین والرد علی الضلال والمبتدعة..]

## حوجحە و سیفاتی و گەیشتنی

سیفاتی حوجە کەوا حوجەی موشریکان ناهێڵێ، وە عوزر ناهێڵێ لەبۆ خاوەنەکەی، بریتیە لە کەلامی الله تعالی قوڕئان، هەر کەسێ قوڕئانی پێ گەشت ئەوە لەسەری دەبێتە حوجەیەک کەوا بەهۆیەوە هیچ عوزرێک بۆ کافر و موشریکان نامێنێتەوە، جا هەر کەسێ حوجەی پێ گەیشت جا لێی تێگەشت یان تێینەگەشت ئەوە حوجەکەی لەسەر کراوە،

## وە بەڵگەکان دەربارەی

**بەڵگەی یەکەم** : الله تعالی دەفەرموێت : **(وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا الْقُرْآنُ لِأُنذِرَكُم بِهِ وَمَن بَلَغَ)[الانعام/١٩]** واتە : الله ئەم قوڕئانەی بۆمن وەحی کردوە بۆ ئەوە ئاگادارتان بکەمەوە ئەوەی پێی گەیشت.، ڕوونە**{إنذار}**ئاگادرکردنەوەی بەندەکان بریتیە لە بەڵگە، بۆ کێ ؟ **{بِهِ وَمَن بَلَغَ}** بۆ هەر کەسێ پێی گەیشت.

**بەڵگەی دووەم** : الله تعالی دەفەرموێت : **(كِتَابٌ أُنزِلَ إِلَيْكَ فَلَا يَكُن فِي صَدْرِكَ حَرَجٌ مِّنْهُ لِتُنذِرَ بِهِ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ)[الأعراف/٢]**واتە : کتێبێک بۆتۆ هێنراوەتە خوارەوە، خۆت توشی دڵتەنگی مەکە ،بۆ ئەوەی بەهۆیەوە خەڵکی پێ ئاگاداربکەیتەوە وە یادخستنەوەیەک بێت بۆ ئیماندارا‌ن.، **{لِتُنذِرَ بِهِ}**ئاگادارکردنەوەیان بە چی؟ بە **{كِتَابٌ أُنزِلَ إِلَيْكَ}**بەو قوڕئانەی دابەزیوە، هەر کەسێ قوڕئانی پێ گەشت ئەوە ئاگادار کراوەتەوە.

**بەڵگەی سێیەم** : الله تعالی دەفەرموێت : **(وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ)[توبة/٦]** واتە : ئەگەر یەکێ لە موشریکان هانای بۆتۆ هێنا بۆ ئەوەی بیپارێزی، ئەوە بیپارێزە تا گوێبیستی قسەکانی خودا دەبێت،ئینجا پێی ڕابگەیەنە کە مایەی خۆپارستنەکەت ئیمانهێنانە بەالله، ئەمەش لەبەر ئەوەیە ئەوان گەلێکی نەزانن.، وە هەروەها ئەم ئایەتە پیرۆزە بەڵگەی بڕاوەیە وڕونکەرەوەیە بۆ نەهێشتنی

عوزری موشریکان لە لایەن موسڵمانان بە چی؟ بە گوێبیست بون وگەیشتنی{يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ}قورئان.

**بەڵگەی چوارەم** : الله تعالى دەفەرموێت : **(لَمْ يَكُنِ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَالْمُشْرِكِينَ مُنفَكِّينَ حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ الْبَيِّنَةُ-رَسُولٌ مِّنَ اللَّهِ يَتْلُو صُحُفًا مُّطَهَّرَةً)[البينة/١]**

واتە: ئەوانەی کافربون لە خاوەنی کتێبەکان لەگەڵ موشریکان، وازیان لە بیرو باوەڕی خۆیان هێنا، هەتا بەڵگەو نیشانەی ڕوون و ئاشکرایان بۆ نەهات، پێغەمبەرێک لەلایەن الله ـوە چەند پەڕەیەکی چاک دەخوێنێتەوە.، ئەمەشیان بەڵگەیەکی ڕوون و بڕاوەی الله تعالى ـیە، کەوا ڕونی کردەوە بۆمان**{مُنفَكِّينَ}** وازیان لە دینەکەیان نەهێنا تا چ؟ **{تَأْتِيَهُمُ الْبَيِّنَةُ}**تا ئەو کاتەی بەڵگەو ڕونکەرەوەیان بۆ هات، کە ئەمەش حوجەیە، پاشان الله عز وجل باس و ڕونکردنەوەی سیفاتی**{الْبَيِّنَةُ}** بۆ دەکات کەوا: **{يَتْلُو صُحُفًا مُّطَهَّرَةً}** ئەو پەیامەی رسول الله دەیخوێندەوە کەوا کتێبی الله ـیە بەڵگەیە لەسەریان و دەبێتە حوجە هەر وەک و رب العالمين ڕونی کردەوە بۆمان.

**بەڵگەی پێنجەم** : الله تعالى دەفەرموێت : **(وَسِيقَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًا حَتَّىٰ إِذَا جَاءُوهَا فُتِحَتْ أَبْوَابُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِ رَبِّكُمْ وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا قَالُوا بَلَىٰ وَلَٰكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ الْعَذَابِ عَلَى الْكَافِرِينَ)[الزمر/٧١]**
واتە: پێیان گووتن: ئایا پێغەمبەران لە خۆتان نەهاتن بۆلاتان بەڵگە و نیشانەکانی الله تان بەسەردا بخوێنێتەوە و ئاگادارتان بکاتەوە بەگەیشتن و ترس لەرزیئەم ڕۆژەتان،ووتیان: بەڵێ بۆمان هاتن، بەڵکو وشەی سزا و ئازاردان ڕەوا کرا لەسەر کافران.،

**بەڵگەی شەشەم** : رسول الله صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت:{قورئان بەڵگەیە بۆت یان لەسەرت}رواه المسلم

**بەڵگەی حەفتەم** : رسول الله صلى الله عليه وسلم دەفەرمێت:{سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە هیچ کەسێ نیە گوێی لێم بێت لەم ئومەتانە یەهودی بێ یان نەسڕانی پاشان مردبێت و ئیمانی بەوە نەهێنابێ کە بۆی ڕەوانەکراوم، ئەوە بەتەئکیدی ئەوە لە هاوەڵی ئاگرە}[رواه احمد ومسلم واللفظ لأحمد]

ئەمانە گشتی بەڵگەنە لەسەر ئەوەی حوجەبریتیەلە قوڕئان بە گەیشتنی جێگیر دەبێ لەسەرکەسەکان، لەوانەیە کۆمەڵێکی دڵ نەخۆش بڵێن: خۆ رسول الله بۆی دەخوێندنەوە و تێی دەگەیاندن! ئێ؟ بە گوێ بیست بون واتا تێگەیشتن!! لەوەڵامی ئەم گومانەی دڵ نەخۆشەکان دا دەڵێین: رسول الله صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت:{قەومانێک لە پاش ئێوە دێن تەنها پەڕاوێک دەبینن و ئیمانی پێ دەینن} جا رسول الله خۆی وەڵامی ئەم دڵ نەخۆشانە ئەداتەوە کەوا گەشتنی ئەو پەڕاوە کە بریتیە لە قوڕئان بەهەرکەسێ بگات حوجەیە لەسەری هەر وەک و رسول الله دەفەرموێت،

ئیبن قەیم{رحمه الله} دەڵێت:(بەڕاستی حوجەی الله تعالى گەیشتوە بە بەندەکان بە ناردنی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم وە ناردنی کتێبەکەی وە گەیشتن بە هەرکەسێ لەوەدا، وە ئەو کەسە توانای علم وەرگرتنی هەبێ جا کەسەکە جاهیل بێ یان عالم، جا هەر کەسێ توانای هەبوو شارەزایی وەرگرێ و لەوەی الله فەرمانی پێ کردوە و بەوەی لێی قەدەغە کردوە کەم تەرخەم بێت تێیدا نەزان بێت ئەوا بەڕاستی حوجەی پێ گەیشتوە{إقامة الحجة}، وە الله تعالى هیچ کەس سزانادات تەنها لە پاش گەیشتنی ئەو حوجەیە بێت کە بۆی هاتووە، جا گەر سزای دا لەسەر تاوانەکەی ئەوا سزای داوە لە سەر حوجەکە ـی و ستەمەکەی، هەر وەک و الله تعالى دەفەرموێت : **(وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولً)[الإسراء/١٥]** وە دەفەرموێت : **(كُلَّمَا أُلْقِيَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ-قَالُوا بَلَىٰ قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِي ضَلَالٍ كَبِيرٍ)[الملك/٨-٩])[مدارج السالكين/ ج١ ص٢١٧]** شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب{رحمه الله} دەڵێت:( ئەوەی باست کرد لە ووتەی شێخ{مەبەست ابن تيميه}، هەر کەسێ پێداگری شتێ بکا ئاوا و ئاوا، وە حوجەشی پێ گەشتبێ، وە ئێوەش گومانتان هەبێ لەو تاغوطانە و شوێنکەوتوانیان، ئایا حوجەیان پێ

گەیشتوە! ئائەمەلە سەیروسەمەرەکاندایە، چۆن گومانتان هەیە لەوەدا لە کاتێکدا چەندین جار ڕونم کردۆتەوە بۆتان؟!، ئەو کەسەی حوجەی پێ نەگەیشتوە بریتیە لەو کەسەی تازە موسڵمان بوە، یان کەسێ لە وڵاتێک و شوێنێکی دوور بژی لە موسڵمانان، یا لە مەسائیلە خەفیە کان، نمونە صرف و عطف، بە کافر دانادرێن هەتا نەیزانن، بەڵام ئەو بنچینەی دین کەوا الله ڕوونی کردۆتەوە و موحەکەمی کردوە لە کتێبەکەیدا، کەوا بەڕاستی حوجەی الله بریتیەلە قورئان، جا هەر کەسێ قورئانی پێ گەیشت ئەوە حوجەی پێ گەیشتوە، بەڵام بنچینەی کێشەکە ئەوەیە ئێوە جیاوازی ناکەن لە نێوان{إقامة الحجة}گەیشتنی حوجەکە و{فهم الحجة} تێگەیشتن وزانینی حوجەکە، بەڕاستی زۆرینە کافر و مونافیقان لە موسڵمانان، هەر تێنەگەیشتینە و نەزانن بە حوجەی الله لە گەڵ ئەوەی پێیان گەیشتوە، هەر وەک و الله تعالى دەفەرموێت : **(أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا)[الفرقان/٤٤]**واتە : وای دادەنێن کەوا زۆرینەی ئەوکافران گوێ دەگرن وتێیدەگەن! بەڵکو ئەوانە وەک و ئاژەڵەکانن بەڵکو ئەوان لە ئاژەڵەکان زیاتر ڕێگایان بزر کردوە.، جا گەیشتنی حوجە جۆرێکە و، تێگەیشتنیش لێی جۆرێکی تر، بەڕاستی حوجە گەیشتووە وە تێگەیشتنیش بابەتێکی ترە، وە کافربونیان بە پێ گەیشتنیانەتەنها، وە ئەگەر لێشی تێنەگەن.)[الدرر السنية ج١٠ ص٩٣-٩٤]

**ئایا فهم الحجة مەرجە لە اقامە حجة دا؟**

تێگەیشتن لەماناکەی مەرجە لە گەیشتنی حوجە، بەڵام تێگەیشتن لە حوجەکە وەک و ئەو تێگەیشتنەی ئەهلی ئیمان تێیگەیشتونە وەریانگرتوە ئەوە مەرج نیە لە گەیشتنی حوجە، جا تێگەیشتن دوو جۆر تێگەیشتنە، هەروەک و بیستن دوو جۆرە، وە هەروەک و هیدایەت دو جۆر هیدایەتە، بۆیە الله تعالى لەسەر کافران جۆرێکی جێگیر کردوە لە بیستن و عەقڵ و هیدایەتیان، وە لەسەر ئیمانداران جۆرێکی تر

**دوو جۆری بیستن**

**یەکەمیان** : بیستنێکی درکی پێ بکات: ئەمەش الله تعالى جێگیری کردوە بۆ کافران هەر وەک و دەفەرموێت : **(وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا قَالُوا قَدْ سَمِعْنَا لَوْ نَشَاءُ لَقُلْنَا مِثْلَ هَٰذَا إِنْ هَٰذَا إِلَّا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ)[الأنفال/٣١]** واتە : کاتێ بەڵگەکانی ئێمەیان بەسەردا دەخوێندرایەوە، دەیانگووت: هیچ نیە پێشتر بیستومانە و ئەگەر ئارەزوومان لێبێت ئێمەش دەتوانین لەنمونەی ئەو بەڵگانە بڵێین، مەگەر هەر ئەفسانە کۆنەکانن.،

ئەم بیستنە بیستنی ئەوەیە درکی پێ بکات پێی گەیشتوە بەڵام مانای وانیە لێی وورد بوبێتەوە و تێیگەیشتبێت

**دووەم** : بیستنێکی وەڵامدانەوە: الله تعالى دەفەرموێت : **(وَلَوْ عَلِمَ اللَّهُ فِيهِمْ خَيْرًا لَّأَسْمَعَهُمْ وَلَوْ أَسْمَعَهُمْ لَتَوَلَّوا وَّهُم مُّعْرِضُونَ)[الأنفال/٢٣]** واتە: ئەگەر الله زانیبای خێرێکیان هەیە ئەوە گوێبیستی دەکردن، وە ئەگەر گوێبیست ـیشی کردبان ئەوە پشتیان لێ دەکرد.، وە دەفەرموێت دەربارەی بەسەرهاتی ئەهلی ئاگر : **(وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ)[الملك/١٠]**واتە : گوتیان: ئەگەر هاتبا و گوێبیست بونایە و ژیریمان بەکارهێنایە ئەوە ئێستا لەهاوەڵانی ئاگر نەدەبوین.،

لێرەدا الله تعالى باسی زانست ویستی خۆیمان بۆ دەکات کەوا گەر ویستی لێبا و بیزانیبا خێر تێیاندایە ئەوە گوێ بیستی دەکردن، ئەم گوێ بیست بونەیش بە تێگەیشتن جیا لە گوێبیست بونی یەکەم، وە لەسوڕەتی مولك الله تعالى باسی ئەو کافرانەمان بۆ دەکات کەوا گوێ بیستی قوڕئان بوبون و درکیان بەوەش دەکرد کە لە ئایەتی پێش ئەوە دەڵێن**{قَالُوا بَلَىٰ قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ}**بەڵێ ئاگادار کەرەوەیەکیان بۆ هات وەک و ئەو بیستنەی سەرەتا پاشان بە ڕاستیان دا نەنا، جا لەم ئایەتە خۆزگە دەخوازن و دەڵێن**{لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ}**ئەگەر گوێبیست باین و لێی ورد ببانەوە و ژیریان تێیدا بەکار بهێنابا، کەواتە ئێستا بیستنەک کەوا تێبیگات بەڵام مانای وانیە تێی گەیشتبێت بیستنی دووەم ئەوەیە گوێبیست بێت و تێیگەیشتبێ و لێی وورد بوبێتەوە، جا الله تعالى لێرەشدا کەوا ئەمانە تەنها ئیقامە حوجە کرابون تەنها پێیان گەیشتبوو عوزری پێ نەدان بەڵکو**{أَصْحَابِ السَّعِيرِ}** لە هاوەڵانی ئاگرن، لە گەڵ ئەوەی تێشی نەگەیشتبوون**{لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ}**.

**دوو جۆری عەقڵ**

**یەکەم** : عەقڵێک پێویست کرایە لەسەری کەوا لە ماناکەی تێی بگات، کەوا الله تعالی دەفەرموێت : (**أَفَتَطْمَعُونَ أَن يُؤْمِنُوا لَكُمْ وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَسْمَعُونَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُ مِن بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ يَعْلَمُونَ)[البقرة/٧٥]** واتە: ئایا چاوتان لەوەیە کە ئەوانە ئیمان بەئێوە بێنن؟ بەدڵنیاییەوە دەستەیەک لەپێشینانی ئەوان گوێ بیستی قسەکانی الله دەبوون، پاشان دوای ئەوەی تێیدەگەیشتن لایان دەدا لەڕاستیەکەی و بۆخۆشیان دەیانزانی.، الله تعالی لێرەدا جێگیری کرد لەسەریان بەوەی گوێبیست بونە و لەمانا و مەبەستەکەی پاشان تێگەیشتونە و زانیویانە.

**دووەم** : کەوا عەقڵ پێیەوە پەیوەست دەبێ کە گوێی لێ بوو تێبفکری و خۆی شارەزا بکات لێی و وەڵامی بداتەوە، هەر وەک والله تعالی دەفەرموێت : (**وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ)[الملك/١٠]**واتە: گوتیان: ئەگەر هاتبا و گوێبیست بونایە و ژیریمان بەکارهێنایە ئەوە ئێستا لەهاوەڵانی ئاگر نەدەبوین.، وە دەفەرموێت : (**وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِآيَاتِ رَبِّهِ فَأَعْرَضَ عَنْهَا وَنَسِيَ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ إِنَّا جَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِي آذَانِهِمْ وَقْرًا وَإِن تَدْعُهُمْ إِلَى الْهُدَىٰ فَلَن يَهْتَدُوا إِذًا أَبَدًا)[الكهف/٥٧]** واتە: کێ لەو کەسە ستەمکارترە کە کاتێ بەڵگەو نیشانەکانی ئێمەی بۆ باس دەکرێت، ئەوا پشتی لێ هەڵدەکا، و لەبیری دەچێتەوە کە دەستەکانی کردویانە، ئێمە پەردەی داپۆشەرمان هێناوە بەسەر دڵیان دا، کە ناهێڵێ تێبگەن، وە لەگوێیەکانیاندا کەڕیەکمان داناوە، وە ئەگەر داوای هاتنە سەر ڕێگای هیدایەتیشیان لێ بکەی، ئەوا قەت نایەنەسەر ڕێگای هیدایەت.- الله اکبر - الله تعالی لەم دوو ئایەتەشدا باسی کەسانێکی بۆ کردین کەوا قورئانیان بەسەیدا خوێندراوەتە و پێیان گەیشتووە**{ذُكِّرَ بِآيَاتِ رَبِّهِ}** جا ئەوان **{فَأَعْرَضَ عَنْهَا}**پشتیان لێی هەڵکردوە و پشتگوێیان خستوە، کاتێ حوجەکەیان پێ گەیشت و پشتگوێیان خست، جا الله تعالی دڵەکانی داپۆشین کە نەتوانی لە حەق تێبگات وە گوێیەکانیشیان کەڕیەکی دابەسەری لە ئاست حوجەکەوە، جا ڕێک ئەو خەڵکانەیە کەوا هاتون و ڕۆشتون و تا ئەوانەی ئەم سەردەمەش کێ هەیە ئەو حوجەیەی پێ نەگەشت بێت کێ هەیە بە هەموو ئاسانکاریەکی خۆ شارەزا کردن و شوێن

کەوتن بۆی ئاسان نەکرابێت؟؟ کەس نیە مەگەر زۆررر بەدەگمەن شتی وا دەزاندرێ لە دونیا، پاشان کە ئەو حوجەیەیان لە بەر دەستە و پێیان گەیشتوە چیان کردوە **{فَأَعْرَضَ عَنْهَا}**پشتیان هەڵکردوە لەو حوجەیە و پشتگوێیان خستوە جا هەرکەسێ وابکات وەک نمونەی ئەم سەردەمەی خۆمان کەوا حوجەیان پێ گەیشتوە و پشتگوێیان خستوە، الله تعالی ـیش دڵی داپۆشیون بۆ ئەوەی لە حوجەکە تێنەگەن وە کەڕی کردون لە ئاست ئەم حوجەیە بۆ ئەوەی نەتوانن گوێبیستی بن و تێی بگەن، جا الله تعالی گەیشتنی بەڵگەکانی کردە حوجەلە سەری و کردی بە بیانوو برێکی بڕاوە**{وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ}**ئەگەر هاتبا و گوێبیست بونایە و ژیریان بەکارهێنایە ئەوە ئێستا لەهاوەڵانی ئاگر نەدەبوین.

**وە هیدایەتیش دوو جۆر هیدایەتمان هەیە**

**یەکەم** : هیدایەتی ڕێنمونیکەر: هەر وەک و الله تعالی دەفەرموێت : **(وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَاهُمْ فَاسْتَحَبُّوا الْعَمَىٰ عَلَى الْهُدَىٰ)[فصلت/١٧]** واتە:گەلی ثەمودیش ڕێگای ڕونمان نیشان دان، ئەوانیش کوێر بونیان لەلا خۆشەویستر بوو لە بینینی ڕێگای الله.، وەدەفەرموێت : **(وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ)[الشورى/٥٢]** واتە: بەڕاستی تۆ ڕێگا نیشاندەری بۆ ڕێگای ڕاست.، هیدایەتی پێ گەیاندن و ڕوون کردنەوە کەوا بریتیە لە قوڕئان بە ڕونی گەشتۆتە دەست گشت کەسێ.

**دووەم** : هیدایەتی قەبوڵ کردن و وەڵامدانەوەی: هەروەک و الله تعالی دەفەرموێت : **(إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ)[القصص/٥٦]** واتە: تۆ ناتوانی ئەوەی کە خۆشت بوێت بیهێنیە سەر ڕێنمایی الله، الله ڕێگای ڕێنمویی خۆی بەو کەسەدەدات کە خۆی ویستی لەسەرە.،وەدەفەرموێت : **(لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَاهُمْ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ)[البقرة/٢٧٢]** واتە : ڕێنمویکردنی دڵی کافرەکان لە ئەستۆی تۆ نییە، بەڵکو الله ویستی لەسەر هەر کێ بێ دەیهێنێتە سەر ڕێگای ڕێنموی خۆی.، هیدایەتی تێگەیشتنی دڵ و دەرون بەرەو ڕێگای هیدایەتی الله تعالی

جا هەر کەسێ ئەو ڕونکەرەوەی پێ گەیشت ئیدی دەبێتە بەڵگەیەک لەسەری لە دونیا و قیامەت، وە هەرکەسێکیش هیدایەتی وەرگرت بە تێگەیشتنەوە ئەوەشیان بەڵگەیە بۆی لە دونیا و قیامەت لەسەری.

جا الله تعالی سیفاتی گەیشتنی حوجە{إقامة الحجة}مەرج دار کرد بە گوێبیستبونێکی درک پێ کردن، وە تێگەیشتنی مانا، هیدایەتی ڕێنمویی کەوا لەسەرەوە باسمان کرد و بەڵگەکانیمان دانا، جا سیفاتی گەیشتنی حوجە{إقامة الحجة} پەیوەست کرد پێیان بە نەێشتن و بڕینی عوزر بۆیان بەم سیفاتانە، وە پەیوەستی نەکرد بە سیفاتی تێگەیشتن لە حوجە{الفهم الحجة}کەوا باسمان کرد، وە تەنها گەیشتنی ئەو حوجەیەی پەیوەستکرد پێیان و کردی بە بەڵگە لە سەر بەندەکانی بۆیان**{وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ}**ئەگەر هاتبا و گوێبیست بونایە و ژیریمان بەکارهێنایە ئەوە ئێستا لەهاوەڵانی ئاگر نەدەبوین، وەک و گشت بەڵگەکانی تر، جا تێگەیشتن و ڕونکردنەوە و وردبونە لەبۆیان مەرج نیە لە کافر نەبونیان و سزا نەدانیان هەر وەک و الله تعالی بۆمانی ڕوون کردەوە. وە ئەم سیفاتانەش بە دوو مەرج تێپەڕ دەبن:

**مەرجی یەکەم** : حوجەکە بگات بە کەسەکە بەو زمانەی لێی تێدەگات، هەر وەک و الله تعالی دەفەرموێت : **(وَمَا أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ)[الإبراهيم/٤]** واتە: هیچ پێغەمبەرێکیشمان نەناروە، مەگەر بەزمانی گەلەکەی خۆی بۆ ئەوەی شتەکانیان بۆ ڕوون بکاتەوە، جا الله ویستی لەسەر کێ بێ گومڕایی دەکا و ویستیشی لەسەر کێ بێ دەیهێنتە سەر ڕێگا ڕێنمویەکەی خۆی،جا الله خاوەن دەسەڵاتێکی بێوێنەو کاردرووستە.، وە لە حەدیثی وەفدی عبدالقیس لە ئەبی جمرەوە دەڵێت:(من وەرگێر بوم لەنێوان ئیبن عباس و خەڵکی)[صحیح المسلم]

ئیبن تیمیە{رحمه الله}دەڵێت:(وە زاندراوە ئەم ئومەتە فەرمانی پێکراوە بە گەیاندنی قوڕئان بە دەربڕین و ماناکەیەوە، هەروەک و فەرمان بە رسول الله کراوە،وە گەیاندنی ئەم پەیامە ناکرێ تەنها بەم شێوەیە نەبێ وە گەیاندن لەبۆ عەجەم پێویستی بە وەرگێڕێ دەبێت بۆی، وەرگێڕانەکە

بەپێی شوێنەکان وە وەرگێڕانیش پێویستی بە باس کردنێکی هاوشێوە و هاو وێنەی ماناکە دەبێ، بەم شێوەیە وەرگێڕان تەواو دەبێت)[مجموع الفتاوی/ج٤ ص١١٦]

ئیبن قەیم{رحمه الله} دەڵێت:(بەندە دان بەوەدا دەنێت بەوەی حوجەی الله گەیشتوە پێی، جا گوێڕایەڵبێ یان سەرپێچیکار،بەڕاستی حوجەی الله تعالی گەیشتوە بە بەندەکان بە ناردنی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وە ناردنی کتێبەکەی وە گەیشتن بە هەرکەسێ لەوەدا، وە ئەو کەسە توانای علم وەرگرتنی هەبێ جا کەسەکە جاهیل بێ یان عالم، جا هەر کەسێ توانای هەبوو شارەزایی وەرگرێ و لەوەی الله فەرمانی پێ کردوە و بەوەی لێی قەدەغە کردوە کەم تەرخەم بێت تێیدا نەزان بێت ئەوا بەڕاستی حوجەی پێ گەیشتوە{إقامة الحجة})[مدارج السالکین١/٢٣٢]

**مەرجی دووەم** : گەیاندنەکە ڕوون بێت: هەر وەک و الله تعالی دەفەرموێت : **(وَقَالَ الَّذِينَ أَشْرَكُوا لَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا عَبَدْنَا مِن دُونِهِ مِن شَيْءٍ نَّحْنُ وَلَا آبَاؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن دُونِهِ مِن شَيْءٍ كَذَٰلِكَ فَعَلَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَهَلْ عَلَى الرُّسُلِ إِلَّا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ)[النحل/٣٥]** واتە:ئەوانەی شیرکیان ئەنجام دابوو ووتیان: ئەگەر الله ویست لەسە بایە ئەوە ئێمە و باوک و باپیرانمان جگە لەو شتێکی ترمان نەدەپەرست وە بێ فەرمانی ئەوان شتێکمان لەسەرخۆمان قەدەغە ناکرد، ئەوانەی پێش خۆشیان هەر بەم شێوەیەیان کرد، جا ئایا لە گەیاندنێکی ئاشکرا زیاتر چی لەسەر پێغەمبەرانە؟.، وە دەفەرموێت : **(وَاحْذَرُوا فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَاعْلَمُوا أَنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ)[المائدة/٩٢]** واتە: ئاگاداربن گەر پشتهەڵبکەن، ئەوە بزانن بەڕاستی ئەوەی لەسەر پێغەمبەرەکەی ئێمە پێویستە گەیاندنێکی ئاشکرایە.، وەدەفەرموێت : **(وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِلَّ قَوْمًا بَعْدَ إِذْ هَدَاهُمْ حَتَّىٰ يُبَيِّنَ لَهُم مَّا يَتَّقُونَ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ)[التوبة/١١٥]** واتە: الله هیچ کاتێ وانەبووە گەلێ گومڕا بکات پاش ئەوەی هیدایەتی داون، تا بۆی ڕون نەکردبنەوە کەپێویستە خۆیان بپارێزن، بەڕاستی الله تعالی بەهەموو شتێک زانایە.، وە سیفەتی گەیاندنێکی ئاشکرا ئەوەیە کە ئیبن تیمیە{رحمه الله}دەیڵێت:( وە ووتەی الله تعالی : **(وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا**

**يَعْلَمُونَ)[توبة/٦]** زاندراوە کەوا وەڵام لێرەدا ئەوەیە بە بیس تنێک بتوانێن لەگەڵی لە ماناکەی تێبگات، وە مەبەست پێی نەگەیشتیە بەتەنها بە گوێبیست بونی دەربڕینێک کەوا نەتوانێت لەگەڵی لەمانای وشەکە تێبگات، وە ئەگەر جگە لە عەڕەبی بوو ئەوە پێویست دەبێ وەربگێڕدرێ بۆ ئەوەی حوجەکەی پێ بگات، وە ئەگەر لە عەڕەبیش بوو وە لە قوڕئاندا هەندێ دەربڕینێ نامۆ هەن کەوا لە زمانەوانی دا نین،پێویستە ماناکەی ڕونبکرێتەوە، وە ئەگەر گوێشیان لێی بوبێ تێینەگەیشتون کەوا زۆرێ پرسیار لەمن دەکەن بۆ تەفسیر کردن و ڕونکردنەوەی ماناکە)[الجواب الصحيح لمن بدل دين المسيح ٦٨/١]

جا ئەمە سیفەتی گەیاندنێکی ئاشکرایە کەوا حوجەکەی پێ بگات کەوا بتوانێن لەماناکەی تێبگات وە ڕوون بێت بۆی، هەر وەک و ئەو سەردەمەی خۆمان حوجەکەمان قوڕئان کەوا گشت کەسێ لایەتی و پێی گەیشتووە بەمەرجی یەکەم بە زمانی خۆی وە مەرجی دووەم بە ڕوونی و وازحی کەوا حوجەی الله زۆر ڕوون و وازحە بۆ بەندەکانی گەر ملکەچ بن بۆی هەر وەک و الله تعالی دەفەرموێت : **(وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ)[القمر/١٧]** واتە: بەڕاستی قوڕئانیشمان ئاسان کردووە بۆ ئامۆژگاریوەرگرتن، جا ئایا کەسێک هەیە پەندی لێوەربگرێت.، جا گەیاندنێکی ئاشکرا پەیوەستە بە گەیشتنی حوجە کاتێ پێی دەگات بە زمانی خۆی بێت وە ڕونبێت بتوانێ لێی تێبگات، جا بەمە دەبێتە بەڵگەیەک لەسەری و عوزری دابڕێت و نامێنێ، وە لەسەرەوە باسی ئەو سیفاتانەی گەیشتنی حوجە و تێگەیشتنی حوجەمان کرد کەوا الله تعالی بۆی ڕون کردینەوە لە بیستنێک درکی پێ بکات و عەقڵێک بتوانێ لەماناکەی تێبگات وە هیدایەتێک کەوا ڕێنمویی بۆ هاتبێت،جا الله تعالی مەرجی گەیشتنی حوجەی پێ ڕاگەیاندوین و باسی کردوە بۆمان جا بەوەوە زانیمان کەوا گەشتن حوجە بەڵگەیە لەسەر کەسەکان وگشت عوزرەکانی بنبڕ دەکا و نایهێڵێ.وە ئەم بابەت و باسە ڕونکەرەوەیەک بوو بۆ بابەتی عوزر بە جەهل بۆ تێگەیشتنی وە وەڵامێکی بنبڕی تێدا بوو بۆ ئەو کەسانەی هەموو بەڵگەیان بۆتە قسەی عەقڵیان کە دەڵێن:(کەسەکان نەزانن خۆ ئەگەر پێیان بڵێی کاکە ئەوەت هەڵەیە ئەوە ڕاستەوخۆ دەڵێ استغفرالله نەمزانی هەڵەیە، بۆیە عوزری هەیە نەزانە!) بەڕاستی ئەم ووتەیە ووتەیەکی کوفریە و بە درۆخستنەوەی ئایەتەکان و بەڵگەکانی الله تعالی ـیە کەوا لەسەرەوە باسمان کرد و دامان نا کە الله تعالی خۆی باسی بەندەکانی دەکا لە

گەیشتنی حوجە و هیدایەت دانی، بەڕاستی ئەم ووتەیە هیچ کەسێکی موسڵمان وهیچ کەسێکی عاقڵ نایکات، هەر یەکێک بە دڵ ئەم باسە و ئایەتانەی سەرەوە بخوێنتەوە وتێبگات ئەم قسە باطڵ و خەراپە ناڵێت و تێی دەگات، تەنها مەگەر کەسێک کەوا الله تعالی لەسەرەوە باسیانی کرد بۆمان کەوا دڵیانی داپۆشیوە و ناتوانن لەحەق تێبگەن وە گوێیان کەڕ بوە لەئاست حەق وە چاویان کوێرە لە ئاست حەق ناتوانن تێبگەن و ڕەتی دەکەنەوە-پەنادەگرین بە الله تعالی لەم جۆرە کەسانە.

## مەسائیلە ئاشکراکان{الظاهرة}

بریتیە لەو مەسائیلانەی کەوا تێیدا هیچ عوزرێک قەبوڵ نیە هەرکەسێ بکەوێتە ناوی پێی کافر دەبێ، جا ئایا حوجەی پێ گەیشتوە یان پێی نەگەیشتوە یان تێگەیشتوە یان تێینەگەیشتوە هیچی بۆی نابێتە عوزر، کەوتە نێو هەر هەڵوەشێنەرەوەیەک لەو مەسائیلە ظاهیریانە ئەوە پێی کافر دەبێ جا نەزان بێت یان زانا بێت، بەڵگەش لەم بارەیەوە ئەوبەڵگانەی سەرەتا دامان نان لەنەبونی عوزر بۆ کەسی موشریک و کافر کە دەکەوێتە نێوی ڕاستەوخۆ ناو و سیفاتی کارەکەی بەسەردا جێگیر دەبێ، پێویست ناکا دوبارە دایان بنێینەوە، جا ئەو مەسائیلە ظاهیریەکان بریتین لەو بابەتانەی کەوا بە پێویست و گرینگ داندراون و لە دین دا بە زانینیان و نابێ هیچ یەکێک لێی بێ ئاگا بێ و نەزان بێ پێی

١-مەسەلەیەکە زانینی بەگرینگ داندراوە لەدیندا کەوا واجبە تاک و گشت بیزانن کەوا لە دینی موسڵمانان دایە

٢-بابەتێکی ئیجماعیە بەڵگەکانی موحەکەمن و بابەتێکی توقیفیە و هیچ شوبهەو تەئویل و تێکەڵ کردنێک لە خۆ ناگرێت

ئەو بابەتانەی دەچنە نێو مەسائیلی ظاهیری

١-تەوحیدی بە گشت بەشەکانیەوە پەرستراوێتی و پەروەردگارێتی و ناو و سیفاتەکان

٢-کارە ئاشکراکان و جەخت لەسەرکراوەکان وە ئەرکانەکانی ئیسلام

٣-بەحەڕام دانانی حەڕامەکان بەگشتی،، وەبەحەڵاڵ دانانی حەڵاڵەکان بە گشتی

شێخی ئیسلام ئیبن تیمیە{رحمه الله}دەڵێت:(هەرکەسێک پێداگری لە واجبە ئاشکرا جەخت لەسەرکراوەکان بکات، یان پێداگری حەڕامەئاشکراکان بکات، وەک و خەراپەکاری و ستەم و مەشڕوب و زینا و ڕیبا، یان پێداگربێ حەڵاڵێتی بەشێ لە ڕێگەپێدراوە ئاشکراکانبکات، وەک و نان و گۆشت و نیکاح، ئەوە کافر و موڕتەدە، تەوبەی پێ دەکرێ یان تەوبەی لێ دەکات یان دەکوژرێ)[مختصر الفتاوى المصرية/٢٤٥]

وەدەڵێت:(وە ئەمەش ئەگەر لە ووتە شاراوەکان{خفية}ـبوو،کە تێیدا دەڵێین: ئەو کەسە هەڵەکارێکی گومڕایە و حوجەی پێ نەگەیشتووە کەوا خاوەنەکەی کافر بکات،بەڵکو بەشێک لەوانە کەوتۆتە نێو کارە ئاشکراکان{الظاهرة} کەوا گشت و تایبەت تێیدا دەزانێت لە دینی ئیسلام، بەڵکو یەهودی و نەسرانیش دەزانن رسول الله صلى الله عليه وسلم بۆ ئەوە نێردراوە و جیاواز بوون لێی کوفرە، نمونە لە فەرمان کردنی بە پەرستنی الله بە تەنها بێ هیچ شەریک بۆ دانانێک، وە ڕێگری کردن لە پەرستن بۆ هیچ یەکێک جگە لە الله، لە مەلائیکەت و پێغەمبەران و ڕۆژ و مانگ و ئەستێرەکان و بت و وە جگە لە وانە، کەوا ئەمانە دیارترینی سیمای ئیسلامن، وە نمونەی فەرمان کردن بە کردنی پێنج نوێژە فەڕزەکان، وەڵامدانەوەی، وە بەگەورەدانانی، وە لەنمونەی دژایەتی کردنی یەهودی و نەسڕانی و موشریکان و صابیئەکان و مەجوسەکان، وە نمونەی حەڕامێتی خەراپەکاری و ڕیبا و مەشڕوب و قومار وە هاوشێوەی ئەمانە، پاشان دەبینی زۆرێک لەسەرکانیان دەکەونە نێو ئەەو کارانە و دەبنە موڕتەد)[مجموع الفتاوى ٥٤/٤] جا گشت کەسێ بکەوێتە نێو ئەم مەسائیلە ظاهیریە ئەوە موڕتەد دەبێتەوە جا پێویستە تەوبەی پێ بکرێ جا تەوبەی کرد یان دەکوژرێت، هیچ عوزرێکی پێنادرێت، جا تەوحید و شیرک کەوا زانینیان بەگرینگ ترین شت داندراوە لە دین دا کەوا زۆرربەی خەڵکی لەمانەداتێدەکەون و ئەنجامی ددەن هۆکارەکەشی نەزانینیانە بەڵام ئەو نەزانینەیان هیچ عوزرێک و لێخۆشبونێکیان پێنادات بەڵکو ئەوەی سودی هەبێ بۆیان ئەوەیە بگەڕێنەوە لای الله تعالى و تەوبە بکەن و شوێن ئەو زانستە بکەون کە الله تعالى دایبەزاندووە و شارەزای بن تێیدا

## چ کەسانێک لە مەسائیلی ظاهیری دا عوزریان پێدراوە؟

١- منداڵ یان کەسێکی شێت فەهم نەکات

١-کەسێک تازە موسڵمان بوبێ

٢-کەسێک لە وڵاتێک و شوێنێکی دوور لەموسڵمانان بژیێ کە نەتوانێ علم وەرگرێ وگوێی لەو پەیامەبێ کە رسول الله هێناویەتی ببێ

ئیبن تیمیە{رحمە الله}دەڵێت:(هەرکەسێ پێداگری لە کارە ئاشکراکان بکات ئەگەر کەسێکی تازە موسڵمان بوبیت یان لە وڵاتێکی پڕ لەنەزانی بێ بەکافرداناندرێ تا حوجەی پێغەمبەری پێدەگات)[مجموع الفتاوی٦/٦١]

وەدەڵێت:(پێویست نیە لەسەرگشت کەسێک حوکم بدەیت بەکافر تا ئەو کاتەی مافی مەرج و ڕێگریەکان{شروط والموانع} لەسەرجێگیر دەبێ، وەک و ئەو کەسانەی بڵێن: مەشڕوب حەڵاڵە لەبەر تازە موسڵمان بونیان یان لە شوێنێکی دوور بێت)[مجموع الفتاوی ١٦٥/٣٥] شیخ محمدی کوڕی عبدالوهاب {رحمە اللّه}دەڵێت:(چۆن گومانتان هەیە لەوەدا لە کاتێکدا چەندین جار ڕونم کردۆتەوە بۆتان؟!، ئەو کەسەی حوجەی پێ نەگەیشتوە بریتیە لەو کەسەی تازە موسڵمان بوە، یان کەسێ لە وڵاتێک و شوێنێکی دوور بژی لە موسڵمانان)[الدرر السنیة ٩٣/١٠] ڕێگری و مەرجەکان لە حوکمی کوفر دان بەسەر بکەرەکە ئەمانەنە کە باسیان لێوە کرا کەوا کەسێ تازە موسڵمان بێت یان دوور بێت لەموسڵمانان و  نەتوانێ علم وەرگرێ و گوێبیستی پەیامەکە بێت،جا ئەوەی کە لە شوێنێکی دوور بێت و نەتوانێ علم وەرگرێت زۆر دڵ نەخۆش هەن دەیهێنن لەگەڵ خەڵکی ئەم سەردەمەی دەگونجێنن و دەڵێن ئەها ئاوا و...، پێیان دەڵێین: مەبەستی ئەوان لەکەسانێکە لە سەحرایێ لە جەزیرەک بن کەوا نەتوانن و پێیان نەگەیشتبێت، نەوەک کەسێک کەوا لە هەموو سەردەمێک و لە هەموو کات و ساتێک ئاسانتر علم وەردەگیرێ و دەست دەخسترێ بۆ کەسێ مەبەستیبێ و هەوڵی بۆ بدات بەڵام لێرەدا پێویستە جیاوازیەک بکەین لە نێوان دوو چین کەسی موسڵمان تازە موسڵمان بوە یان دوور لە موسڵمانان و شوێنی موسڵمانان بێت ئەگەر پێداگری لە حەڵاڵێک یان حەرامێک کرد لەبەر تازە موسڵمان بونەکەی یان دووور بونەکەی ئەوا حوکمی کوفری بەسەرانادرێت تا ئەو کاتەی پێ

ڕادەگەینن پاشان ئەگەر پێداگیری کرد حوکمی کوفریشی بەسەردا جێگیر دەبێ و دەکوژرێ و سزاشی بۆ هەیە لە قیامەت دا، بەڵام بەر لەوەی پێ ڕابگەیندرێت حوکمی ڕیدەی بەسەرا نادرێت، ئەمەش جیاواز لەگەڵ ئەوەی کەوا تەنها گەیشتنی حوجە بەکەسەکان دەبێتە حوجە لەسەری بەڵام لەو حاڵەتەدا پێویستە ڕابگەیندرێت پێی لەبەر ئەوەی کارەکە لەتوانای ئەو دانیە، گەر نا لە ئیقامە حوجەدا مەرج نیە تێبگات و لەسەریشی دەبێتە حوجە

## مەسائیلە شاراوەکان{الخفي}

بریتیە لەو مەسائیلەی کەوا خاوەنەکەی ڕاستەوخۆ حوکمی کوفر و ڕیدەی بەسەرا نادرێت بەڵکو پێی دەگوترێت: هەڵەکارێکی گومڕا و ناوی کارەکەی بەسەردا جێگیر دەبێ، ئەمەش لەبەر ئەو شاراوەیی ئەم مەسەلەیە کەوا کەسەکان نەتوانن زانستەڕاستەکەی بەدەستبینن ولە توانای دا نیە، هەروەک و الله تعالى دەفەرموێت : **(لا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا)[البقرة/٢٨٦]** واتە : الله تعالى ئەرک ناخاتە سەر هیچ کەسێک مەگەر بە قەدەر توانایی خۆی نەبێت.، جا بەندەکان گەر کەوتنە نێو مەسائیلێکی شاراوە کەوا پێی ناوترێت شاراوە، تەنها ئەو کاتە نەبێ کە کەسەکە لەتوانای دانەبێ بەم کارە هەستێ و بتوانێ شارەزایی لێ بەدەست بێنێ و بیدۆزێتەوە، وە هەروەها دەفەرموێت : **(فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ)[التغابن/١٦]** تەقوای الله تعالى ـتان هەبێت ئەوەندەی لەتواناتان دایە، واتای ئەوەنیە چەندت حەز لێ بوو چەندت پێ خۆش بو پشتی لێ هەڵکەی یان کەمتەرخەم بی، نا بەڵکو پێویستە بە هەموو هێز و توانایەک بۆ فێربونی و کارپێکردنی هەوڵ بدەی جا ئەوکاتە ئەگەر شتێک نەتتوانی لەسەرت نیە و کەسێ بەحاڵی بزانێ حوکمی کوفری بەسەرنادا بەڵکو تەوبەی پێ دەکا، جا گەر پێداگیری بکات ئەوە حوکمی ڕیدەی بەسەرا دەدرێت

مەسائیلی خەفی بریتیە لە:

١-مەسەلەیەکی نەزاندراوە کەوا زانینی بەگرینگ دانەندراوە وەبەربڵاو نیـە لە نێو خەڵکیـدا

٢-مەسەلەیەک کەوا لە نێوان ئەم مەسەلانە ناکۆکیان هەیە لەگەڵ ئەهلی سوونە کەوا شوبهەیەک دروست دەکەنتێـیدا

٣-مەسائیلێکە کەوا بە تێڕوانینێ ناتواندرێ درکی پێ بکرێت بەڵکو بە عەقڵیش ناتواندرێت

وە لە نمونەی ئەوانەشدا مەسائیلی ئەسماء ـو سیفاتی الله تعالى کەوا بابەتێکە ناکۆکی هەیە لە ئەهلی سوننە لە گەڵ ئەوانەی تردا، کەوا ووتەیان لەبارەی قورئان دروستکراوی الله ـیە، یان نەفی کردنی بینینی یان بەرزبونەوەی الله تعالى، ئەمانەش بەشێکی کەمی بابەتی ئەسماء و سیفات دەگرێتەوە، بەڵام بابەتەکانی تری نمونە وەکو توانا و علم و.. کەوا دەچنە نێو مەسائیلی ظاهیری، جا الله تعالى ئەسماء و سیفاتی هەیە بۆ هیچ یەکێک نیە ڕەتی بکاتەوە، جا کەسێ جیاواز بوو لێی پێویستە ئیقامە حوجە بکرێت لەم بابەتەدا لەبەر شاراوەییەکەی، بەڵام بەر لە ئیقامە حوجەکردنی ناوی کارەکەی بەسەردا جێگیر دەبێ بەڵام حوکمی کوفری بەسەرا نادرێت، هەروەک و لەو ئایەتانەدا باسمان کرد کەوا بابەتی ئەسماء و سیفات یەکەم: لە نێو مەسائیلی دیندا شاراوە و شارەزابونی زەحمەترە وەک و مەسائیلەکانی تر وە دووەم: ئەوەیە ئەم بابەتە عەقڵ ناتوانێ درکی پێ بکات وەک و بابەتی تەوحیدی پەروەردگارێتی کەوا بەوەوە لە قیامەت بەندە پێوە شاهێدی لەسەر دەدرێت

وە هەروەها بابەتە فروعیەکان کەوا زاندرا و بەربڵاو نەبن، نمونە وەک و حەڕامێتی زەواج لەگەڵ پور یان مێردی وەیان بکوژێکی بە ئەنقەست میراتی بۆ نیە وەیان هاوشێوەی ئەمانە کەوا شاراوەن هەرکەسێ پێداگیری تێدا کرد حوکمی کوفری بەسەرا نادرێت تا ئەو کاتەی ئیقامە حوجە دەکرێت

ئیبن تەیمیە{رحمه الله} دەڵێت:( ئەم ووتەیە کوفرە وەک و ووتەی جەهمیەکان کەوا دەڵێن: نە قسە لە گەڵی دەکرێ نەبینینی لە ئاخیرەتدا، بەڵام لەلای بەشێکی خەڵکی شاراوەیە{الخفي}ـە کوفرە، جا بە موتڵەقی و گشتی دەڵێین کەسێ ئەمە بکات کافرە، هەروەک و پێشینان دەڵێن: قورئان دروستکراوی الله ـیە ئەوە کافرە، وەیان بڵێن: الله تعالى نابیندرێ لە ئاخیرەتدا ئەوا کافرە، بەڵام کەسی دیاری کراو بەکافر دانانێین تا ئەو کاتەی حوجەی پێ دەگات)[مجموع الفتاوى ٦١٩/٧]

جا سیفاتی گەیشتنی حوجە لە مەسائیلی خەفی دا بریتیە:

١- بەڵگەی پێبگات

٢-وە تێی بگات و گومانی نەمێنێ

ئیبن تیمیە{رحمه الله} دەڵێت:(وە ئەمەش ئەگەر لە ووتە شاراوەکان{خفية}ـبوو،کە تێیدا دەڵێین: ئەو کەسە هەڵەکارێکی گومڕایە و حوجەی پێ نەگەیشتووە کەوا خاوەنەکەی کافر بکات)[مجموع الفتاوى ٥٤/٤]

جا شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب دەربارەی ئەم ووتەیەی ئیبن تەیمە ڕونکردنەوە دەدات و دەڵێت:(ئا ئەمە سیفاتی قسەکردنیتی لەو مەسەلەیەدا لە هەموو بابەتێک لەسەر ووتەکانی وەستاوین، وە باسی ئەوە ناکات تەکفیری کەسی دیاری کراو نەکات تەنها ئەگەر کێشەیەکی تێدا هەبێ، وەمەبەست لەوەستان لە تەکفیر کردنی بەر لە پێگەیشتنی، وە ئەگەر پێی گەیشت ئەوە حوکمی ئەو کارەی بەسەرِدا دەدرێت کە هەڵیوەشاندۆتەوە لە هەربابەتێک لە تەکفیردا یان تەفسیق، وە ڕەحمەتی الله ـی لێ بێ وتەکانیشی ڕاشکاون کەوا لە گەڵ جگە لەمەسائیلی ظاهیری ـتی)[الدرر السنة ٩/٤١٨]

جا ئەمە مەسائیلی خەفی ـیە کەوا عولەمایان تایبەتیان کردوە بەبەشێک لە بابەتی صیفاتدا یان ناکۆکیەکانی هەن لەنێو ئەو بابەتە شاراوانەدا، بەڵام مەرج نیە ئەوەی ئەوان دیاریان کردوە ئێستا بۆ خەڵکی ببێتە مەسائیلی خەفی لەبەر ئەوەی ئەم کارانە لەو کاتی خەفی بونە، ڕاستە بابەتی صیفات لە هەموو سەردەمێکدا شاراوەیە تا حەدێک بەڵام مەرج نیە گشتی وەک و ئەوان بێت، لەبەر ئەوەی ئەم سەردەمەی ئێستا گەر کەسێک مەبەستی زانست وەرگرتن بێن و شوێنکەوتنی بێت تا ڕادەیەکی زۆر ئاسان بوە لەوەرگرتنی کەوا لەتوانای دایە ئەگەر چی ماندوو و هیلاکی بکات لە ڕێگای وەرگرتنی زانستەکەوە، عیبرەت لەم بابەتەدا ئەوەیە کەسەکە لەتوانای دا هەبێ، جا ئەوەی ئەوان باسیان لێوە کردوە دەبێتە بابەتێکی شاراوە بەڵام بە گشتی نا وە هەندێ دڵ نەخۆش دەیانهەوێت لە ڕێگای مەسائیلی خەفیدا عوزر بۆ کەسی موشریک و کافر بێننەوە کەوا بابەتەکە هیچ پەیوەندیەکی بە مەسائیلی خەفی وەنیە بەڵکو دژیەتی ئەمانە ناچنە نێو مەسائیلی خەفی دا، جا لەم بابەتەدا هەرکەسێ کەوتە

ناوی و ئەنجامی دا ئەوە ڕاستەوخۆ حوکمی کوفری بەسەرا نادرێت تا ئەو کاتەی پێی دەوترێ و گومانەکەی لادەبردرێت بە جیاواز لەگەڵ مەسائیلی ظاهیریـدا.

جا دەربارەی ئەم جیاکردنەوە کەوا ووتەی ئیبن تەیمیەمان دانا، جا زانایانی نەجد وەڵامی ئەو کەسانە دەدەنەوە و ووتەی ئیبن تەیمیە ڕون دەکەنەوە هەروەک و ووتەی شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب ـیشیان دانا دەربارەی ووتەی ئیبن تەیمیە ڕەحمەتی الله یان لێبـــێ

-شێخ عبدالله ـی کوڕی عبدالرحمن ابو بطین{رحمه الله} لە ڕیسالەکەیدا وەڵامی ئەو کەسانە دەداتەوە کەوا دەڵێن شەیخ الإسلام ئیبن تەیمیە تەکفیری کەسی دیاریکراو(معین)ناکات، جا ئەم ووتەی شێخ نەقڵ دەکا و دەڵێت:( وە ووتەکانتان: کە شەیخی ئیسلام گوتویەتی: هەرکەسێ لەکارە شیرکیەکان ئەنجام بدات، بە موطڵەقی حوکمی لەسەر نادرێ بە موشریک و کافر تا ئەو کاتەی حوجەی پێ دەگات، ئەمەی دەیڵێ لە شیرکی گەورەدانییە یان عیبادەت کردن بۆ جگە لە الله وە هاوشێوەی ئەمانە لە کوفر، بەڵکو ووتەکەی دەربارەی کارە خەفیەکانە، هەروەک و ووتەکەیان نیشاندان کەدەڵێت:وە ئەمەش لە ووتە شاراوەکان{خفیة}ـە)[الدرر السنية- ١٠/٣٨٨]

شێخ حمد کوڕی عتیق{رحمه الله}لە داننانی بە مەزهەبی شێخ لە جیاوازی لە نێوان مەسائیلی ظاهیر و خەفی لە مەسائیلی تەکفیری دیاریکراو(معین) ـدا دەڵێت:(مەسئەلەی تەکفیری موعەیەن مەسەلەیەکی زاندراوە، ئەگەر گووتیان ئەو ووتەیە کوفرە، دەڵێن: هەرکەسێ وابڵێ ئەوە کافرە بەڵام کەسی دیاریکراو ئەمەی ووت حوکمی کوفری بە سەردا نادەین تا حوجەی پێ دەگات کەوا پێی کافر دەبێ!، ئەمە لە مەسەلە خەفیەکاندایە، کەوا لە بەشێک لە خەڵکی شاراوەن، هەروەک و لەمەسەلەی ئیرجاء و قەدەر وەهاوشێوەی ئەمانە، کەوا بەشێ لەووتەکان کوفری دەیانگرێتەوە کە ڕەدی قوڕئان و سونەتن، ڕەتکردنەوەی دەقەکانی کوفرین بەشێ لەم ووتانە دەگرێتەوە، حوکم نادەین لە سەر خاوەن ووتەکە بە کوفرە، کەوا لەوانەیە ڕێگرێکی نەزانی هەبێ، و نەزان بێت بە بنچینەی دەقەکە یان بەڵگەکە کەوا پەیوەست نابێ لەسەری تا ئەو کاتەی حوجەی پێ دەگات، باسی کردوە شێخی ئیسلام ئیبن تیمیە{رحمه الله}لەزۆربەی کتێبەکانیدا، وە باسی ئەوەشی کردوە و دانی بەو مەسەلەیە داناوە، دەڵێت:وە

ئەمانە لە مەسائیلی خەفیەکانن کەوا بەکافر داناندرێت، بەڵام ئەوانەی دەکەونە نێو مەسائیلە ظاهیریە ئاشکراکان یان ئەوانەی زانینیان لە دین بەپێویست داندراوە ناوەستین لە تەکفیر کردنی کەسەکەی دەیڵێ)[الدرر السنية ٤٣٣/١٠]

شێخ ابو بطين{رحمه الله}دەربارەی ئەم ووتەیەی شێخی ئیسلام دا دەڵێت:(سەیرکەن لە جیاکردنەوەی لە نێوان مەسائیلە ظاهیریەکان و کارە خەفیەکان، کەوا لە دەربارەی خەفیەکان دەڵێت ئەمە کوفرە و تێیدا دەڵێت ئەمانە هەڵەکارێکی گومڕان کەوا حوجەیان پێ نەگەیشتوە کەوا خاوەنەکەی کافر دەکەن، بەڵام ئەمەی نەووت لە مەسائیلە ظاهیریەکان، بەڵکو ووتی:پاشان دەبینی زۆرێک لەسەرکانیان دەکەونە نێو ئەو کارانە و لە موڕتەدەکانن، حوکمی بە ڕیدەکەیان دا بە موطڵەقیان وە نەوەستا لە سەر نەزانەکەیان، وە ووتەکەی ئاشکرایە لە جیاکردنەوەی کارەوفریە خەفیەکان)[الدرر السنية ٣٥٥/١٠]

جا جیاوازیەکە لە گەڵ مەسائیلی ظاهیری دا ئەوەیە ، مەسائیلی ظاهیری هەرکەسێ بکەوێتە ناوی بە موتڵەقی ناو و حوکمی کوفری بەسەردا دەدرێت، بەڵام مەسائیلی خەفی ناوی کوفری بەسەردا جێگیر دەبێ وە حوکمەکەی دەوەستێت تا ئەو کاتەی ئیقامە حوجە دەکرێت لەم بابەتەی تێی کەوتووە

## عوزری نەزانین لە تەکفیردا

مەبەست لە عوزر بۆ نەزان لە کاتی تەکفیر کردنیادا، نەزان تەکفیر دەکرێت هەرکاتێک کەوتە نێو کوفر یا شیرک ناو وسیفاتی کارەکەی بەسەردا جێگیر دەبێ، جا کەسەکە حوجەی پێنەگەشت بێت گەر کەوتە نێو کوفرەوە نەزانیش بێت تەکفیر دەکرێت، یان کەسەکە حوجەیَ پێ گەیشتوە و نەزانیشبێت کافر دەبێت، وە ئەوەی لە حوجەکەش تێی گەیشتوە یەک حوکم دەیانگرێتەوەلەگەڵ نەزانەکە پێی، بەڵگەش لەم بارەیەوە دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ ئەو ئایەت و بەڵگانەی لە سەرەتادا دامان نا، هەروەک و بینیمان و زانیمان کەوا نە الله تعالی نە رسولەکەی هیچ عوزرێکیان بۆ کەسی کافر و موشریک نەهێناوەتەوە بەرلەوەی حوجەشی پێ بگات کەوتۆتەنێو شیرکەوە بە موشریک ناوی هاتوە، وە زانیشمان کەوا الله تعالی ورسولەکەی حوکمیان لەسەر کەسانێ داوە کەوا نەزانن و هەست بەخۆیان ناکەن و مەبەست و ویستێکی چاکیشیان هەیە پاش ئەوەی حوجەشیان پێ گەیشتوە بەڵام نەزانن و ئەم نەزانینەیان عوزریان پێ نادات بەڵکو ڕاستەوخۆ سیفات و ناوی کارەکەیان بەسەردا جێگیر دەکەن، پێویست ناکات بەڵگەکان دوبارە دابنێینەوە لەسەرەتا دامان نا بۆ ئەوەی زیاتر بەڵگەکان ڕوون بێت بۆ خوێنەر و جیایانبکاتەوە.

## عوزری نەزانین لە کوشتاردا

مەبەست لە عوزر بۆ کەسی نەزان لە کوشتنی دا، بریتیە لەو کەسەی حوجەی پێ نەگەیشتوە ئەو کەسە کوشتاری ناکرێت تا ئەو کاتەی دینی الله تعالی ـی پێ ڕادەگەیەندرێ و بەرگوێی دەخرێت،ناوی کوفر و شیرکەکەی هەرلەسەرجێگیر دەبێت بەڵام کوشتار ناکرێت تا ئەو کاتەی حوجەی پێ دەگات، هەروەک و الله تعالی دەفەرموێت : **(وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ)[توبة/٦]** واتە : ئەگەر یەکێ لە موشریکان هانای بۆتۆ هێنا بۆ ئەوەی بیپارێزی، ئەوە بیپارێزە تا گوێبیستی قسەکانی خودا دەبێت،ئینجا پێی ڕابگەیەنە کە مایەی خۆپارستنەکەت ئیمانهێنانە بەالله، ئەمەش لەبەر ئەوەیە ئەوان گەلێکی نەزانن.، هەر وەک و بینیمان الله تعالی ناوی شیرکی

لەسەر جێگیر کرد بەر لە گوێبیست بون و پێگەیشتنی حوجەکەی پاشان فەرمانی کرد و ڕێگای داوە کەوا موشریکان پەنابدرێن بۆ ئەوەی گوێبیست بن و حوجەکەیان پێ بگات جا یان ئیمان دێنن یان جیهاد و کوشتاریان بەرامبەر دەکرێت و ئیسلام پەناگەیان نابێت، مەگەر ئەهلی ذیمە بن لە ئەهلی کتێبەکان.

## عوزری نەزانین لە سزادان

هەر کەسێ پەیامی پێغەمبەر و بەڵگەی قورئان و سوننەتی پێ گەیشت ئەو کەسە عوزری نامێنێ لە لایەن الله تعالى لە سزادانی لە ڕۆژی دوایدا، واتا هەر کەسێ حوجەی پێگەیشت ئیدی ئەو کەسە نە لەدونیا نە لەلایەن الله تعالى عوزری بۆ نیە، بەڵام کەسێک کەوا هیچ پێغەمبەر و پەیامێکی بۆنەهاتبێت ئەو کەسە لە دونیادا بەکافر دادەندرێت بەڵام لە لایەن الله تعالى عوزری هەیە و سزانادرێت هەر وەک و دەفەرموێت : **(وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولً)[الإسراء/١٥]** واتە : سزای کەسمان نەداوە تا ئەو کاتەی پێغەمبەرێکمان بۆ ناردوون.، وەک و ئەهلی فیترە کەوا لە دوونیادا بەکافر دادەنرێن وە لە ئاخیرەت دا لەلایەن الله تعالى ـوە سزا نادرێن.،

## جیاوازی نێوان مەبەستی کردار و مەبەستی کوفر

مەبەستی کردار: واتا کەسێ مەبەستیەتی کارێ بکات یان ووتەیەک بڵێت کوفر بێت، جا با خۆشی پێی وابێ کردار یان ووتەیەکی چاکە کوفر نیە، پێی کافر دەبێ ئەگەرچی مەبەستی کوفریش نەبێ

بە جیاواز لە گەڵ ئەوانەی هەڵە دەکەن کەوا مەبەستیان کردار نیە واتا عەقڵیان لەدەست دەدەن و بیر و هۆشیان لەسەر خۆیان نامینێ لە کاتی کردار یان ووتەیان کە کاتێ بڵێن وات کردوە بڵێ شتی وام نەکردوە، نمونە وەک و ئەو ڕێبوارەی لە دڵخۆشیا ووتی(یارب تۆ بەندەی منی من پەروەردگاری تۆ)والعياذ بالله جا ئەمە مەبەست و ویستی کردار نەبووە، جیاوازە لە

گەڵ کەسی نەزان یان کەسێ تەئویلێک دەکات و دەکەوێتە ناو کوفر و شیرک ئەو کەسە بە ویستی خۆی دەیکا گەرچی پێی وابێ کارەکە ئیمانە و چاکە ئەوە نابێتە عوزر بۆی و کافرە

مەبەستی کوفر: کەسێ مەبەستیەتی کوفر بکات و دەزانیت کوفرە و دەیهەوێت کوفر بکات ئەو کەسەش بەهەمان شێوە کافرە

شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە{رحمه الله} دەڵێت:(وە بەگشتی هەرکەسێ قسەیەک بکات یان کردارێک پێی وابێت کوفر نیە پێی کافر دەبێت ئەگەر چی مەبەستیشی نەبێت کەوا کافر بێت، خۆی هیچ یەکێک مەبەستی کوفر نیە مەگەر ویستی الله ـی لەسەربێت)[صارم المسلول/١٧٧]

## ووتەی زانایان

الحمدلله لە پاش نەقڵ کردنی بەڵگەکان لە قورئان و سوننەتدا لە نەبونی عوزر بۆ نەزانو پاشان ڕونکردنەوە و بەشەکانی، دێینە سەر ئیجماعی ئەهلی علم لە سەر نەبونی عوزر بۆ نەزان، خۆی ووتەکانیان ئێجگار زۆرە لەسەر ئەم بابەتەو وەڵامیان لەسەر نەبونی عوزر بۆ نەزان بەڵام بەشێکی کەم نەقڵ دەکەین لە ووتەکانیان بۆ درێژ نەبونەوەی بابەتەکە و ئەو ووتانەیانم داناوە کەوا بنچینەی بیروباوەڕیتیان بۆ ئەوەی بیروباوەڕ و حاڵی علمایان لە لای خوێنەر چاکتر ڕوون بێت و تێبانبگات ان شاءالله تعالی:

### ووتەی زانایانی حەنەفی دەربارەی عوزر بە جەهل

١-ئیمامی ئەبو حەنیفە دەڵێت :(عوزر بۆ کەسێ نیە نەزانبێ بەناسینی دروستکەری، لەبەر ئەوەی لەسەر گشت دروستکراوێ واجبە پەروەردگاری بناسێ بەپاکی وتوحیدەوە، هەروەک و دەیبینێ کێ ئەرز و ئاسمانی دروستکردوە، وە جگە لەوە کە الله دروستی کردوە)[بدائع الصانع للكسائي ٤٣٧٨/٩]

٢-صدرالدين قونوی حنفی قوتابی ابن كثير، دەڵێت:(ئەگەر بە ئاشکرا کوفریەکی دەربڕی ئەگەر بیروباوەڕشی پێی نەبێ کافرە، لەبەر ئەوەی ڕاستەوخۆ ڕازی بوە پێی، وە ئەگەر ڕازیش

نەبێ بە حوکمەکەی، وەک و گاڵتەکردنێ، ئەوە کافر دەبێ وە هیچ عوزرێکی بە نەزانین بۆ ناهێندرێتەوە وەئەمەش لای گشت زانایانە بەشێک جیاوازن)[شرح فقه الاكبر لملا علي قاري ص٢٤١]

٣- عمری کوڕی محمدی سنامی دەڵێت:(هەرکەسێ کوفریەک دەرببڕێ وە بزانێ و بیروباوەڕیشی وابێ کوفرە ئەوە کافرە، وە ئەگەر بیروباوەڕیشی بەو کوفریە نەبێ و نەیزانێ، بەڵام ئەو ئازاد بوە، وکافرە لەلای گشت زانایان وە عوزری بۆ نیە بە نەزانینی)[نصاب الاحتساب للسنامي ص١٩٢]

٤- بزاز حنفی دەڵێت:(بزانە هەرکەسی قسەیێکی کوفری بکات. لە بابەتە عەقیدەیەکان، بیگومان پیی کافر دەبیتەوە. تەکفیر دەکری، ئەگەر چی عەقیدەشی وابیت کە ئەم قسەیی کوفر نیە، نەزانێت کە کوفری کردووە، تەکفیری دەکری و پیی کافر دەبیتەوە بەم قسەیی، لەلای زۆرینەی زانایانەوە، و عوزی بە نەزانی بۆ نیە)[الأشباه والنظائر على مذاهب أبي حنيفة ٣٠٤/٢]

٥-ووتەی خاوەنانی{المحيط}و خاوەنانی {الحاوي} لە علمایانی مەزهەبی ئەبو حەنیفە: شێخ علی قاری ووتەکانیان نەقڵ دەکات و دەڵێت:(وە لە موحیط و حاوی، بە پوختی هەر کەسێ ووتی من مولحیدم کافرە، وە تەنانەت لە موحیط و حاویی ـدا دەڵێت: ئەگەر نەزانێ ئەمە کوفرە ئەوە عوزری بۆ نیە، ئەمەش حوکمی کارە ئاشکراکانە، والله تعالى ـخۆی زانایە بە شاراوەکان)[شرح الشفا للإمام علي القاري الحنفي ٤٢٩/٢]

**ووتەی زانایانی شافعی دەربارەی عوزر بە جەهل**

٦- ووتەی ابن حجری هیتمی شافعی دان بە ووتەی حەنەفیەکان دادەنێت و موافقە لەگەڵیان لە نەبونی عوزر بۆ نەزان، دەڵێت:( وە ووتەی ئەم حەنەفیە وئەوەی ووتی لەلای مەزهەبی ئێمە درووستە، بەڵکو مەزهەبی ئێمە موافقە لەگەڵ گشتی ووتەکانی تەنها لە بە موتڵەق

دانانەکەی نەبێ لە نەبونی عوزر، لەبەر ئەوەی لای ئێمە عوزر بۆ کەسێ هەیە تازە موسڵمان بوبێ وە کەسێ لە شوێنێکی دوور لەموسڵمانانبێ ودور لەعلم)[الإعلام ص٨٣]

ووتەی ابن حجر ئاشکرایە لە دانپێدانانی بە ووتەکانی حەنەفیەکان موافقبونیان لەگەڵی کەوا پێش ئەمە دامان نا، لە نەبونی عوزر بۆ نەزان، وە ڕونی کردەوە تەنها لەوە نەبێ کەوا کەسێک کەوا لە شوێنێکی دوور لەموسڵمانان بژی گوێی لێیان نەبێ، وە کەسێکیش تازە موسڵمان بوبی

٧-ئیمامی شافیعی دەڵێت:( ئەگەر عوزر هەبوایە بۆ کەسی جاهیل و نەزان لەبەرئەوەی کە نەزانە ، ئەوکاتە جەهل و نەزانین چاکتر دەبوو لە عیلم و زانست ، کە لەم کاتەشدا بەندە ئەم قورس و گرانیەی کە داوای لێ کراوە و خراوەتە ئەستۆی لەسەر شانی سووک و ئاسان ئەبوو ، وە هەروەها دڵیشی ئاسوودە دەبوو لەم سزا و هەڕەشانەی لێی کراوە ، جا نابێتە بەڵگە و بیانوو بۆ بەندە لە نەزانینی حوکمێک دوای ڕاگەیاندنی و دوای ئەوەی کە توانای هەبێت لە فێربوونی، الله تعالی دەفەرموێت : **(لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ)[النساء/١٦٥])[المنشور في القواعد الفقهية للزركشي ١٥/٢]**

٨-ئیمامی طبری شافعی نەقڵی ووتەی ابن حجری عسقلانی دەکات لە{فتح الباري} تێیدا وەڵامی ئەوانە دەداتەوە کەوا مەرجیان بۆتەکفیر داناوە کەوا دەڵێن تەنها کەسی عالم کافر دەبێت، وە دەرچونی لەئیسلام بەمەبەست و زانین بێت، دەڵێت:( تێیدا وەڵامێکە بۆ ئەوانەی دەڵێن: هیچ یەکێک دەرناچێ لە ئیسلام لە ئەهلی قیبلە تەنها لە پاش شایستە بونی نەبێ بە مەبەستی دەرچونی بێ و بزانێت، ئەم فەرمودەیە ووتەکانیان پوچەڵ دەکاتەوە، (حەق دەڵێن و قورئان دەخوێنن ودەردەچن لە ئیسلام و پەیوەندیان بەهیچەوە نامێنێ))[فتح الباري صحيح البخاري ١٢/٣١٣]

٩- ابو عبدالله حلیمی شافعی دەڵێت:(کەسی عاقڵ و ئازاد ئەگەر گوێی لە هەر بانگەوازێک بوو لەلایەن الله تعالی ـوە، وازی لێ بێنێ بە عەقڵی خۆی لەسەر دروستیەکەی، ئەوا ئەو کەسە لەئەهلی ئیستدلالە{سۆفی و فەلسەفیەکان}ـە، جا بەمە پشتی هەڵکردۆتە بانگەواز و کافربوە)[الاوسي في تفسير المعاني ٣٧/١٥]

١٠-ئیمامی سیوطی لە ئیمام زرکشی شافعی نەقڵ دەکات دەربارەی ئەودەربڕینانەی کەوا هیچ یەکێک عوزری تێیدا نیە بەنەزانین وە بۆ هیچ یەکێک لەتێگەیشتنەکەی شێوابێ، بەنمونەی تەوحید و نوێژ و زەکات و..، دەڵێت:(وە ئەوەی هیچ یەکێک عوزری بۆ نیە بەنەزانینی ئەوەیە دەست بکاتە خێرا تێگەیشتن بۆ ناسینی مانای دەقەکانی ئەحکامەکان دەیانگرێتەوە وە بەڵگەکانی تەوحید کەوا ئەم بەشەیان هیچ شێوانێک ولێتێکچونکی تێدانیە لە لێکدانەوەی، کە گشت کەسێ دەبێ درک بە مانای تەوحید بکات لە ووتەی الله تعالی:(فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ)[محمد/١٩] وە هیچ شیرکێک نەکات لە پەرستنیدا، وە ئەگەر نەزانێت (لا) بابەتێکە لە نەفی کردن وەتەنها بۆ جێگیرکردنبێ،کەوا ئەم وشەیە پێویستە وە زانینی لەسەر گشت کەسێ گرینگە، وە پێویستی: نوێژکردن و زەکاتدان و هاوشێوەی ئەمانە داوای واجب بونی ئەم فەرمانەی لێکراوە لەسەری، وە ئەگەر نەزانبێ لە هاوکێشە کردنی واجبیەتی، ئەوە لەم بەشەیان هیچ یەکێک عوزری بۆ نیە کەوا بانگەشەی نەزانیبکات بە مانای دەربڕینەکان، لەبەر ئەوەی زانینی لەسەر گشت کەسێ بە گرینگ داندراوە)[الإتفاق للعلوم القران للسیوطي: ٢٣٢/٢]

**ووتەی زانایانی مالیکی دەربارەی عوزر بە جەهل**

١١-ئیمامی قەرافی مالیکی لەباس کردن جۆرەکانی نەزانین دەڵێت:(جۆری دووەم: نەزانینێ لێبوردنی بۆنیە لەلایەن خاوەنی شەرع لەشەریعەت دا، وە لەو کەسە نابوردرێ لە ئەنجامدانی، هیچ کەسێ عوزری ئاگادارکردنەوەی بۆناهێندرێتەوە، پاڵی بە نەفسی نەناوە ونابوردرێ لێی، وە بەکردار ئەو ڕاسپاردەیەی لەسەر خۆی بەرز نەکردۆتەوە، ئەم جۆرەش بریتیەلە بنچینەی دین یان بیروباوەڕ یان بنچینەی فقهـ وە بەشێک ئەحکامی فقهـی فروعیەکان، بەڵام لە بنچینەی دین ڕەچاوی نەزانین تێیداناکرێت، بەڵکو واجبە زانین و ناسینی بیروباوەڕێکی درووست بە خوێندن یان پرسیارکردن، وە هەرکەسێ دەستی بەبیروباوەڕێکەوە گرت لەگەڵ نەزانین ئەوە تاوانبارە بە تاوانێکی ئاشکراوە، لەبەر ئەوەی شەرع دانەر لەبابەتی بیروباوەڕی بنچینەی دین زۆر لەسەری توندە، هەتا ئەگەر مرۆڤ هەوڵ

و تێکۆشانێکی زۆربکات، ئەوهەوڵدانەی بۆ گۆڕینی گۆڕینی بیروباواڕی ڕاست بێت، ئەوە هەوڵـ{اجتهاد}ـکەی ناکرێتە پێشەنگ بۆ ئەمە، بەڵکو تاوانبارێکی کافرە و زانراوە لەنێو مەزهەبەکاندا، وە عوزری هەڵەکردنی بۆ ناهێندرێتەوە لە هەوڵدانەکەی، لەبەر ئەوەی مرۆڤ داواکراوە بە پێکان بە بیروباوەڕێکی حەقەوە وە ناسینی بەڵگەکانی تاکیەتی الله تعالى ـوە و دەقەکانی بنچینەی دین، وە ئەمەش جیایە لە فروعی فقهی ـدا کەوا لە بنچینەکان نیە کەوا شەرع لێی دەبورێ لەهەڵەکردنی پاش هەوڵدان و گەڕانی، هەروەک و ووتەی رسول الله صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت:(ئەگەر حاکمێک ئیجتیهادی کرد پێکای ئەوە دوو پاداشتی بۆ هەیە وە ئەگەر ئیجتیهادی کرد و نەیپێکا و هەڵەی کرد ئەوە یەک پاداشتی بۆ هەیە))[ الفروق ١٤٩/٢]

١٢- وە دەڵێت:( وەلەبەر ئەمە عوزر بۆ جاهیل نیە لەلای الله تعالى لە بنچینەی دیندا بە ئیجماع)[شرح تنقيع الفصول ص٤٣٩]

١٣- وەدەڵێت:(بەڵێ ئەو نەزانینەی کەسەکە نەتوانێ ئەوڕاسپاردەیەی سەرخۆی بەرزکاتەوە عوزری بۆ هەیە،نمونە وەک و کەسێ خوشکی خۆی مارە بکات وابزانی بێگانەیتی، وە بنچینەی خەراپە کەوا دەچێتە نێو مرۆڤەوە لەم بانگەشانە بریتیە لە نەزانین، وریابە لێی و پێداگری بکە لەسەر زانست وەرگرتن بەڕاستی ڕزگاربونە، وریایی خۆت وەرگرە لە نەزانین لەبەر ئەوەی گومڕاییە)[الإعلام ص٧٦]

١٤- دردیری مالکی لە{شرح الصغير}ـدا دەڵێت:(عوزر بۆ کەسێ نیە نەزان بێت، یان سەرخۆشبێت، یانبێباک بێت یان تورە ڕقلەدڵبێت، یا بڵێ من ئەوەم دەوێت، لە ڕاڤەی ووتەی:(عوزر بۆ جوێندەر نیە بەنەزانی)ـدەڵێت: لەبەر ئەوەی عوزر بۆ هیچ یەکێک نیە لە کوفردا نەزانبێت)[الشرح الصغير باب الردة ص٣٤٧]

١٥- قاضی عیاضی مالیکی دەڵێت:( عوزر بۆ هیچ یەکێک نیە لە کوفردا بەنەزانی، یان بە بانگەشەی خلیسکانی زمانی، یان بەهەرشتێ کە باسمان کرد، ئەگەر ژیریەکەی لەسەر فیترەتێکی پاکبێت، تەنها ئەوە نەبێت کە زۆرلێکراوە و دڵی جێگیرە بە ئیمان)[شرح شفا ٤٣٨/٢]

١٦- ئیمام شمس الدين عرفەی مالکی لە تێبینەکەیدا لە{الشرح الكبير}ـدا دەڵێت:(وە ووتەی:یان گومانی لەوە هەبێت واتا جا ئایا پێی وایە عالمە یان نا،لەبەر ئەوەی حەق ئەوەیە کەوا عوزر نیە بۆ واجباتەکان لە کوفردا بۆ نەزان، هەروەک ڕاشکاوانەیە{ابو الحسن المالکی} لە ڕاڤەی ڕیسالەی{محمد بن أبي زيد القيرواني})[حاشية الدسوقي على الشرح الكبير في فقه المالكية ٣٠٢/٤]

١٧- ئیمامی قەڕافی مالیکی دەڵێت:( بەڵام فروعی، نەوەک بنچینە، خاوەنی شەرع لێی دەبورێ، هەرکەسێ تێیدا هەوڵدانی کرد و هەڵەی کرد ئەوە پاداشتێکی بۆ هەیە، وە کەسێکیش حەق بپێکێ ئەوە دوو پاداشتی بۆ هەیە هەروەک و لە فەرمودەکە هاتووە، زانایان دەڵێن: بنچینەی دین بنچینەی فقهیـ ـش دەگرێتەوە، {ابو الحسن}ـلەمعتمد ـدا لە بنچینەی فقهـدا دەڵێت: بنچینەی فقهـ تایبەت دەبێ بە سێ ئەحکامەوە لەمفقهدا، پێکراو تێیدا یەکە، وە هەڵەکاریش تێیدا تاوانبارە،لاساکردنەوەی ڕێگەپێنەدراوە، ئەمە ئەو سێیەیە کە باسی لێوە کرد لە بنچینەی دیندا بەدیاری کراوی، جا بۆت ئاشکرا دەبێ لە جیاوازی لەنێوان ئەو قاعیدەیەی تێیدا نەزان عوزری تێدا هەیە، وە ئەو قاعیدەیەی نەزان عوزری نیە تێیدا)[الفروق ٢/١٥٠]

١٨-ئیمام احمدـی کوڕی محمدی مالیکی لە بارەی ڕیدەوە دەڵێت:((عوزر بۆ جوێندەر نیە بەنەزانی)لەبەر ئەوەیە عوزر بۆ هیچ یەکێک نیە لە کوفردا بەنەزانی)[بلغة السالك لأقرب المسالك إلى مذهب الإمام مالك ٣/٤٥٣]

١٩- ئیمام صالحی کوڕی عبدالسمیع مالکی دەڵێت:(لەبەر نەزانی یان سەرخۆشی یان بێباکی یانی بەربڵاوی قسەکانی لەزۆر ووتنی، وەکەمی ئاگاداربونی ڕێکخستنی زمانی، ئەوا عوزری بۆ نیە بەنەزانین، وەنە بە بانگەشەی ڕۆچونی زمان)[جواهر الاكليل في شرح مختصر الخليل في فقه المالكية ٢٨١/٢]

**ووتەی زانایانی حەنبەلی دەربارەی عوزر بە جەهل**

٢٠-ئیمام ابن القیمی حەنبەلی دەڵێت:(ئیسلام بریتیە لە تەوحیدی الله تعالى، وە پەرستنی بەتەنهاو بێ هاوبەش بۆ دانانێ، وەئیمان هێنان بە الله و پێغەمبەرەکەی و شوێنکەوتنی هەرچی ئەو هێناویەتی، جا گەر بەندە ئەم کارانە نەکات ئەوە موسڵمان نیە وەئەگەر کافرێکی عیناد نەبێ ئەوە کافرێکی نەزانە{جاهل}، وەمەبەست لەم بەشە کافرێکی نەزانن عینادکار نینە، جا ئەو نەزانینەیان دەریان ناهێنێ لە نێو کوفردا، بەڕاستی کافر ئەوەیە پێداگری توحد بکات و وەرسول الله بەدرۆبخاتەوە، جا عینادی بێت، وە یان نەزانێکی تەقلید بێ لەبۆ ئەهلی عیناد)[طریق الهجرتین ص٣٨٢]

جا ئەم ووتەیەێ شێخ تایبەت نیە بەم جۆرە دیاری کراوەی وەمەبەستی لە تەنها کافری ئەصڵی نیە و تایبەتی نەکردوەبە بدرۆ خستنەوەی پێغەمبەر، بەڵکو ئەگەر دیقەت بدەنە ووتەکەی لەسەرتادا پێناسەی ئیسلامی دەکرد وە پاش پێناسەکەی ووتی هەر کەسێ وانەکا و لابدا لەو تەوحید و تاک پەرستنەی الله تعالى ئەوە موسڵمان نیە ئەگەر کافرێکی عینادکار نەبێ ئەوە کافرێکی نەزانە.

٢١- وەدەڵێت:( هەر کەسێ پشت هەڵبکات لەهیدایەتی ئەم وەحیە هەروەک و الله تعالى باسی کردوە کەوا هەردەبێ وابڵێ لەڕۆژی قیامەتدا، ئەگەر بڵێین: ئایا بۆ ئەمە عوزر هەیە لەو گومڕایەیدا کەوای حیساب کردوە لەسەر هیدایەتە هەروەک و الله تعالى دەفەرموێ دەربارەیان: **(وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ)** دەڵێین: عوزر بۆ ئەو کەسە نیە، وە لەبۆ هاوشێوەی ئەمەش کەوا لەگومڕایی دان، کەوا گومڕاییەکەیان لە پشتهەڵکردن لەو وەحیەی بۆ رسول الله صلى الله عليه وسلم هاتبوو دروستبوە، وە ئەگەر چی پێشی وابی هیدایەتدراو، گەر گومڕا بێ لەبەر کەمتەرخەمی و پشتهەڵکردنەکەیەتی بۆ شوێنکەوتنی بانگەوازی هیدایەت، ئەگەر گومڕابێ بەهۆی پشتهەڵکردنیتی لێی، وەئەمەش جیاوازە لەو کەسەی گومڕایە بەهۆی پێ نەگەیشتنی ئەو ڕیسالەیە، وە نەتوانین بەگەیشتن پێی، ئەمە حوکمێکی ترە،بەڵام تایبەت لەقورئاندا دەربارەی یەکەمیەتی)[التفسیر القیم عند تفسیر الایة ص٣٥٩] قەولەکەی ئیمام زۆر ڕونە دەربارەی کەسانێ کە گومڕابوونە و پێیان وایە لەسەر هیدایەتن، بەڵام شێخ جەخت

لەسەر ئەوە دەکاتەوە کەوا ئەمانە عوزریان نیە ئەگەر چی نەزانن و پێیان وابوە لەسەرهیدایەتن، تەنها ئەوانە جیادەکاتەوە کەوا ئەوپەیامەیان پێ نەگەیشتوە و یان کەسانێ نەتوانن بەو پەیامە بگەن، بەڵام بۆ ئەو کەسانەی کەمتەرخەمن و نەزانن ئازادن دەڵێت(عوزر بۆ ئەو کەسە نیە، وە لەبۆ هاوشێوەی ئەمەش کەوا لەگومڕایی دان) وەدەڵێت( لەبەر کەمتەرخەمی و پشتهەڵکردنەکەیەتی بۆ شوێنکەوتنی بانگەوازی هیدایەت)

٢٢- وەدەڵێت:(بەڕاستی حوجەی الله تعالى گەیشتوە بە بەندەکان بە ناردنی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم وە ناردنی کتێبەکەی وە گەیشتن بە هەرکەسێ لەوەدا، وە ئەو کەسە توانای علم وەرگرتنی هەبێ جا کەسەکە جاهیل بێ یان عالم، جا هەر کەسێ توانای هەبوو شارەزایی وەرگرێ و لەوەی الله فەرمانی پێ کردوە و بەوەی لێی قەدەغە کردوە کەم تەرخەم بێت تێیدا نەزان بێت ئەوا بەڕاستی حوجەی پێ گەیشتوە{إقامة الحجة}، وە الله تعالى هیچ کەس سزانادات تەنها لە پاش گەیشتنی ئەو حوجەیە بێت کە بۆی هاتووە، جا گەر سزای دا لەسەر تاوانەکەی ئەوا سزای داوە لە سەر حوجەکە ی و ستەمەکەی، هەر وەک و الله تعالى دەفەرموێت : **(وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولً)[الإسراء/١٥]** وە دەفەرموێت : **(كُلَّمَا أُلْقِيَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ-قَالُوا بَلَىٰ قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِي ضَلَالٍ كَبِيرٍ)[الملك/٨-٩])**[مدارج السالكين/ ج١ ص٢١٧]

بیروباوەڕی شێخ لە جیاکردنەوەی ئیقامە حوجە و فهم الحجە، ڕونی دەکاتەوە بەوەی حوجە بە بەندەکان دەگات بە هاتنی رسول الله و دابەزینی قوڕئان کەسەکەش توانای هەبێ بەدوای دابچێ و خۆی شارەزا بکات، جا ئەو کەسە جاهیل بێ یان عالم ئەوە حوجەکەی پێ گەیشتوە و عوزری بڕیوە

٢٣- ابن القيم ـدەربارەی فەرمودەی رسول الله صلى الله عليه وسلم کە دەفەرموێ:(ئەگەر بەلای گۆڕی کافرێکدا تێپەڕی ئەوە موژدەی پێبدە بە ئاگر) جا دەربارەی دەڵێت:( ئەمە پەیامێکی توندن و سەرزەنشتکردنیەتی نەوەک گەیاندنی فەرمان و قەدەغەکردنبێ، وە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر گوێبیست بونی خاوەنی گۆڕ و ووتەی زیندوەکان لەگەڵی، وە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەرکەسێ بە موشریکی بمرێت ئەوە لە ئاگردایە وە ئەگەر بەر لەهاتنی پەیامیش بێت

بۆی، لەبەر ئەوەی موشریکان ئەو پاکیەی دینی ئیبراهیم علیه سلام ـیان گۆڕی بە شیرک و ئەنجامیاندا، وە هیچ بەڵگەیەکیان لانەبوو لەلایەن الله تعالی،وە ناشرینیان و هەڕەشەکردنیان بە ئاگر، لانەچووە و زاندراوە لە دینی گشت پێغەمبەران یەکەم و کۆتایان، وە هەواڵی سزادانی الله تعالی بۆ خاوەنەکانیان دەسوڕێتەوە لەنێوان ئومەتەکان و سەدە دوای سەدە، وە حوجەکە گەیشتۆتە گشت موشریکێ هەموو کاتێک، وە بەندەکانی لەسەر فیترەتی تەوحیدی پەروەردگارێتی درووستکردوە کەوا پەیوەستە بە تەوحیدی پەرستراوێتی،جا مەحاڵە لە گشت فیترەتێک و عەقڵێک کەوا جگە لە الله پەرستراوێکی تری هەبێ، وە الله تعالی هیچ یەکێ سزانادات مەگەر بەپێویستی فیترەتەکەی بێت، وە هەمووکاتێک بانگەوازی پێغەمبەران بۆ تەوحید لەسەر زەوی زاندراوە لە نێو ئەهلەکەی، وە کەسی موشریک مافی سزادانی هەیە بە سەرپێچی کردنی پێغەمبەر)[زاد المعاد ٣/٥٩]

جا وەک وئیبام لێرە ئاماژەی پێ دا گەر مانەوەی دینی پێغەمبەر ئیبراهیم علیه سلام بەس بێت بۆ حوجە بون لەسەری و بەموشریک دانان و عوزر برینی، جا چ ئەوانەی قورئان و سونەتیان لەنێو بەجێماوە و ماوەتەوە! وە خۆی ئاماژە بەوە دەکات و دەڵێ(حوجەکە گەیشتۆتە گشت موشریکێ هەموو کاتێک) وە حوجەی ئینسانەکان بە فیترەتەکەیان بەتەوحیدی پەروەردگارێتی لەسەریان حیساب دەبێ.

### بیروباوەڕی شەیخی ئیسلام ئیبن تەیمیە دەربارەی عوزر بە جەهل

شێخ ئیبن تەیمیە ـش هەر لە زانا حەنبەلیەکانە بەڵام پێم باش بوو ووتەکانی جیابکەمەوە و ڕوونتر بێ لەلای خوێنەر

دەقەکان دەربارەی جیاوازی کردنی شێخ لە بەینی مەسائیلی ظاهیری و مەسائیلی خەفی

٢٤- شێخی ئیسلام ئیبن تیمیە {رحمە الله} دەڵێت : (وە ئەمەش لە ووتە شاراوەکان{خفية}ـە،کە تێیدا دەڵێین: ئەو کەسە هەڵەکارێکی گومڕایە و حوجەی پێ نەگەیشتووە کەوا خاوەنەکەی کافر بکات،بەڵکو بەشێک لەوانە کەوتۆتە نێو کارە

ئاشکراکان{الظاهرة} کەوا گشت و تایبەت تێیدا دەزانێت لە دینی ئیسلام، بەڵکو یەهودی و نەسڕانیش دەزانن رسول الله صلی الله علیه وسلم بۆ ئەوە نێردراوە و جیاواز بوون لێی کوفرە، نمونە لە فەرمان کردنی بە پەرستنی الله بە تەنها بێ هیچ شەریک بۆ دانانێک، وە ڕێگری کردن لە پەرستن بۆ هیچ یەکێک جگە لە الله، لە مەلائیکەت و پێغەمبەران و ڕۆژ و مانگ و ئەستێرەکان و بت و وە جگە لە وانە، کەوا ئەمانە دیارترینی سیمای ئیسلامن، وە نمونەی فەرمان کردن بە کردنی پێنج نوێژە فەڕزەکان، وەڵامدانەوەی، وە بەگەورەدانانی، وە لەنمونەی دژایەتی کردنی یەهودی و نەسڕانی و موشریکان و صابیئەکان و مەجوسەکان، وە نمونەی حەڕامێتی خەراپەکاری و ڕیبا و مەشڕوب و قومار وە هاوشێوەی ئەمانە، پاشان دەبینی زۆرێک لەسەرکانیان دەکەونە نێو ئەو کارانە و دەبنە موڕتەد)[مجموع الفتاوی ٥٤/٤]

**ووتەی ئەهلی علم دەربارەی ووتەی شێخ**

شێخ عبدالله ـی کوڕی عبدالرحمن ابو بطین{رحمه الله} لە ڕیسالەکەیدا وەڵامی ئەو کەسانە دەداتەوە کەوا دەڵێن شەیخ الإسلام ئیبن تەیمیە تەکفیری کەسی دیاریکراو(معین)ناکات، جا ئەم ووتەی شێخ نەقڵ دەکا و دەڵێت:( وە ووتەکانتان: کە شەیخی ئیسلام گوتویەتی: هەرکەسێ لەکارە شیرکیەکان ئەنجام بدات، بە موطڵەقی حوکمی لەسەر نادرێ بە موشریک و کافر تا ئەو کاتەی حوجەی پێ دەگات، ئەمەی دەیڵێ لە شیرکی گەورەدانییە یان عیبادەت کردن بۆ جگە لە الله وە هاوشێوەی ئەمانە لە کوفر، بەڵکو ووتەکەی دەربارەی کارە خەفیەکانە، هەروەک و ووتەکەیان نیشاندان کەدەڵێت:وە ئەمەش لە ووتە شاراوەکان{خفیة}ـە)[الدرر السنیة- ٣٨٨/١٠]

شێخ حمد کوڕی عتیق{رحمه الله}لە داننانی بە مەزهەبی شێخ لە جیاوازی لە نێوان مەسائیلی ظاهیر و خەفی لە مەسائیلی تەکفیری دیاریکراو(معین) ـدا دەڵێت:(مەسئەلەی تەکفیری موعەیەن مەسەلەیەکی زاندراوە، ئەگەر گووتیان ئەو ووتەیە کوفرە، دەڵێن: هەرکەسێ وابڵێ ئەوە کافرە بەڵام کەسی دیاریکراو ئەمەی ووت حوکمی کوفری بە سەردا نادەین تا حوجەی پێ دەگات کەوا پێی کافر دەبێ!، ئەمە لە مەسەلە خەفیەکاندایە، کەوا لە بەشێک لە خەڵکی

شاراوەن، هەروەک و لەمەسەلەی ئیرجاء و قەدەر وەهاوشێوەی ئەمانە، کەوا بەشێ لەووتەکان کوفری دەیانگرێتەوە کە ڕەدی قورئان و سونەتن، ڕەتکردنەوەی دەقەکانی کوفرین بەشێ لەم ووتانە دەگرێتەوە، حوکم نادەین لە سەر خاوەن ووتەکە بە کوفرە، کەوا لەوانەیە ڕێگرێکی نەزانی هەبێ، و نەزان بێت بە بنچینەی دەقەکە یان بەڵگەکە کەوا پەیوەست نابێ لەسەری تا ئەو کاتەی حوجەی پێ دەگات، باسی کردوە شێخی ئیسلام ئیبن تیمیە{رحمە اللە}لەزۆربەی کتێبەکانیدا، وە باسی ئەوەشی کردوە و دانی بەو مەسەلەیە داناوە، دەڵێت:وە ئەمانە لە مەسائیلی خەفیەکانن کەوا بەکافر داناندرێت، بەڵام ئەوانەی دەکەونە نێو مەسائیلە ظاهیریە ئاشکراکان یان ئەوانەی زانینیان لە دین بەپێویست داندراوە ناوەستین لە تەکفیر کردنی کەسەکەی دەیڵێ)[الدرر السنیة ٤٣٣/١٠]

شێخ ابو بطین{رحمە اللە}دەربارەی ئەم ووتەیەی شێخی ئیسلام دا دەڵێت:(سەیرکەن لە جیاکردنەوەی لە نێوان مەسائیلە ظاهیریەکان و کارە خەفیەکان، کەوا لە دەربارەی خەفیەکان دەڵێت ئەمە کوفرە و تێیدا دەڵێت ئەمانە هەڵەکارێکی گومڕان کەوا حوجەیان پێ نەگەیشتوە کەوا خاوەنەکەی کافر دەکەن، بەڵام ئەمەی نەووت لە مەسائیلە ظاهیریەکان، بەڵکو ووتی:پاشان دەبینی زۆرێک لەسەرکانیان دەکەونە نێو ئەو کارانە و لە مورتەدەکانن، حوکمی بە ڕیدەکەیان دا بە موطڵەقیان وە نەوەستا لە سەر نەزانەکەیان، وە ووتەکەی ئاشکرایە لە جیاکردنەوەی کارەوفریە خەفیەکان)[الدرر السنیة ٣٥٥/١٠]

٢٥- شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە دەڵێت:(هەر کەسێک لە نێوان خۆی و اللە تعالی دا واسیتەیەک دابنێ و دوعای لێبکا و پشتی پێ ببەستێ و داوای لێبکات ئەوە کوفرە بە ئیجماع)

٢٦- وە دەڵێت:(هەر کەسێ بیروباوەڕی وابێت سەردانی کردنی ئەهلی ذیمە لە کەنیسەکانیان نزیکیان دەکاتەوە لە اللە ، ئەو کەسە مورتەدە، وە ئەگەر نەزانیش بێت بەوەی کە حەڕامە یان بزانێت، جا پێداگیری کرد مورتەدە)[درر السنیة/ج٣ ص٣٦٩]

٢٧- وەدەڵێت:( هەرکەسێ قسە بە هاوەڵان بڵێت یان یەکێک لێیان، یان پەیوەستی بکات بە داواکردن بەوەی عەلی پەرستراوە، یان پێغەمبەرە، یان جبرائیل هەڵەی کردوە، هیچ گومانێک

نیە لە کافر بونیان، بەڵکو هیچ گومان لە کافر بونی ئەو کەسەش نیە کەوا دەوەستێ لە تەکفیر کردنیان)

٢٨- وەدەڵێت:(هەر کەسێ پێی وابێت هاوەڵان هەڵگەڕاونەتەوە لەپاش رسول الله صلی الله علیه وسلم تەنها چەند کەسێکی کەمیان نەبێت ناگات بە دەیان، یان ئەوان لەسنوردەرچون، ئەوە هیچ گومانێک نیە لە کوفری خاوەن ئەم ووتەیە، بەڵکو هەرکەسێ گومانی هەبێ لە کوفریان ئەویش کافرە)[درر السنیة/ج٣ ص٣٦٩]

٢٩- وەدەڵێت:(هەرکەسێک سەرپێچی بکات و خۆبەگەورە بزانێ وەک و ئیبلیس، کافرە بە ئیتفاق، وە هەرکەسێک سەرپێچی بکات بە ئارەزوی بەکافر دادەندرێت لە لای ئەهلی سونە، وە هەرکەسێک کارێکی حەڕام حەڵاڵ بکات کافرە بە ئیتفاق)

شێخ عبدالرحمن ـی کوڕی حسنـی کوڕی شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب{رحمه الله} ئەم ووتانەی شێخی کۆکردونەوەتەو پاشان دەربارەییان دەڵێت:( وە ووتەکانی لەم بارەیەوە زۆرە، تەکفیر کردنی پەیوەست نەکردوە بە کەسی عیناد و پێداگر، بەڵکو زۆربەی ئەوانەی باسی لێوەکردن جاهیلن، نازانن ئەوەی دەیڵێن یان دەیکەن کوفرە، وە هیچ عوزرێکی بۆ نەهێنانەوە بە جەهل لە هاوشێوەی ئەم کارانەدا)[الدرر السنیة ١٠/٣٧٠]

وە پاشان لەپاش باسکردنی قەولی فوقەهاکان دا دەڵێت:( حوکمەکانیان تایبەت نەکردوە بە کەسی عینادکار، بەڵکو زۆر شتیان باس کردوە لە بابەتی حوکمی موڕتەد دا، لە ووتەکان وە لەکردەوەکان کەوا خاوەنەکەی پێی موڕتەد دەبێتەوە، وە حوکمەکانیشیان نەبەستۆتەوە بەکەسی عینادکار)

٣٠- شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە دەڵێت:(هەرکەسێک پێداگری لە واجبە ئاشکرا جەخت لەسەرکراوەکان بکات، یان پێداگری حەڕامەئاشکراکان بکات، وەک و خەراپەکاری و ستەم و مەشرووب و زینا و ڕیبا، یان پێداگربێ حەڵاڵێتی بەشێ لە ڕێگەپێدراوە ئاشکراکانبکات، وەک و نان و گۆشت و نیکاح، ئەوە کافر و موڕتەدە، تەوبەی پێ دەکرێ یان تەوبەی لێ دەکات یان دەکوژرێ)[مختصر الفتاوی المصریة/٢٤٥]

شێخ عبدالرحمن ـی کوڕی حسنـی کوڕی شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب{رحمه الله} دەڵێت لەبارەی ئەم ووتەی شێخ:( شێخی ئیسلام هیچ عوزرێکی نەهێنایەوە بە نەزانینیان، بەڵکو بەکافری دانان وە ووتی ئەمانە موڕتەد بونەتەوە)[تحقيق مذهب شيخ ابن تيمية./٢٧]

٣١- وەدەڵێت:(هەر کەسێک دەرچێت لە پێغەمبەر یان پیاوچاکێک بەجۆرێک بیانپەرستێت، یان بەشێوەی داواکردنی لە بۆ جگە لە الله،نمونە بڵێت: یارمەتیم بدە یان ڕەحمم پێ بکە یان سەرم بخە یان پەنامبدە یان پشتت پێ دەبەستم یان تۆم بەسە یان تۆبۆمن بەسی، وە هاوشێوەی ئەم ووتانە، کەوا بریتیە لە تایبەت مەندی پەروەردگارێتی کەوا چاک ناکرێتەوە تەنها بۆ الله نەبێ، گشتی ئەمانە شیرکن و گومڕایین، خاوەنەکەی تەوبەی پێدەکرێ، یان تەوبە دەکا یان دەکوژرێت، لەبەر ئەوەی الله تعال پەیامەکەی ناردووە، وە کتێبەکەی دابەزاندوە، بۆ ئەوەی بیپەرستن بەتەنها وە هیچ کەسێک تر نەپەرستن لەغەیری)[الرسالة السنية]

٣٢- ئیبن تیمیە دەڵێت:(هەر کەسێ بیروباوەڕی وابێ بەتەنها ووتن و دەربڕینی شەهادە دەیباتە بەهەشت و نایباتە ئاگار، ئەوا ئەو کەسە گومڕایە و پێچەوانەی قوڕئان و سونەت و ئیجماعە)[مختصر الفتاوى المصرية/ص٩٣]

٣٣- شيخ ابو بطين{رحمه الله}ووتەی شەیخی ئیسلام ئیبن تەیمیە نەقەڵ دەکات، دەڵێت:(شێح ئیبن تەیمیە دەڵێت:بەڕاستی تەکفیر و کوشتار وەستاون لە سەر گەیشتنی حوجە- ووتەکەی بەڵگەیە بۆ ڕوون بونەوە لەدوو فەرماندا- تەکفیر و کوشتار- نەوەستاون لەسەر تێگەیشتن لە حوجەکە بە موتڵەقی بەڵکو لەسەر گەیشتنی وەستاوە، جا تێگەیشتن شتێکەو، پێگەیشتن ـیش شتێکی ترە، ئەگەر ئەم حوکمانە وەستابان لەسەر تێگەیشتن و زانین لە حوجەکە، هیچ کەسێک تەکفیر ناکرا و ناکوژرێ تەنها ئەوە نەبێ کە بەتایبەت بمانزانیبایە عینادکارە، وە ئەمەش ڕونکەرەوەیەکی باطڵە، بەڵکو کۆتا ووتەکەی تەعبیر لەوە دەکا کە لەسەر تێگەیشتن لە حوجە، ئەویش لەو مەسائیلانەی شاراوەن لە سەر زۆررینەی خەڵکی، کەوا هەڵوەشێنەرەوەی تەوحید و پەیامەکەی تێدا نیە، بەڵکو نەزانین بە بەشێک لە صیفاتە، بەڵام ئەو کارانەی هەڵوەشێنەرەوەن بۆ تەوحید و ئیمان بەو پەیامە، ئەوە{رحمه الله} ڕاشکاوە لەزۆر بابەتەکاندا لە کافربونی خاوەنەکەی وە کوشتنی لەپاش داوای تەوبە لێکردنی، وە هیچ

عوزرێکی بۆ ناهێنتەوە بەجەهل، لەگەڵ ئەوەی دانبەوەدادەنێن کەوا هۆکاری کەوتنە نێو ئەم کارانە بریتیە لە نەزانین بە ڕاستیەتی، وە ئەگەر بیزانیبایە ئەمە کوفرە و دەری دەکا لە ئیسلام نەیدەکرد، وە ئەمانەش لە ووتەکانی شێخ{رحمه الله} زۆره)[رسالة{الكفر الذي يعذر صاحبها بالجهل والذي لايعذر ص٣٩}]

**ئەمە لە ووتەکانی شێخ بوو کەوا چەند سودێکمان تێیدا بینی**

١-جیاوازی کردن لە نێوان کەسێ دەکەوێتە نێو مەسائیلی خەفی و مەسائیلی ظاهیر لە تەکفیرکردن ـدا.

٢-وەسف کردنی ئەو کەسەی دەکەوێتە نێو کوفرێک لە مەسائیلە خەفیەکان بە هەڵەکارێکی گومڕا.

٣وە وەسف کردنی ئەو کەسەی دەکەوێتە نێو کوفرێک لە مەسائیلە ظاهیریەکان بە موڕتەد و دەرچوو لە ئیسلام.

٤- باسکردنی ئەو کارانەی دەچنە نێو مەسائیلی ظاهیری

٥- تەوحید، فەرمان کردن بە پەرستنی الله بەبێ هیچ هاوبەشێ

٦-شیرک کەوا پەرستنە بۆ جگەلە الله تعالی لە نمونەی مەلائیەکەت و پێغەمبەران و ڕۆژ و مانگ

٧- کارە گرینگەکان لە دین دا نمونەی فەرمان کردن بە پێنج نوێژی فەڕزەکان، وە نمونەی دژایەتی کردنی موشریکان، وە حەڕامێتی خەراپەکاری و مەشڕوب و ڕیبا وقومار.

٨-ئەو کەسەی بەکافر داناندرێت ئەوانەنە کەوا دەکەونە نێو مەسائیلە خەفیەکان لە نمونەی بەشێ لەصیفاتەکان

٩- تەکفیر و کوشتار کردن لە سەر گەیشتنی حوجە وەستاون، نەوەک تێگەیشتن و شارەزابونی

١٠-ئەوانەی تەکفیر دەکرێن ڕاستەوخۆ و بێ هیچ ڕێگریەک ئەوانەنە کەوا دەکەونە نێو مەسائیلە ظاهیریەکان لە نمونەی توحید و شیرک و ئیمان و ولاء وبراء...

١١-نەبونی عوزر بۆ هیچ کەسێک ئەگەر چی جاهیلیش بێت تەنها لەمەسائیلی خەفی،بەڵام لەمەسائیلە ظاهیریەکان هیچ کەس عوزری تێدا نیە بە نەزانین بێ یان شتی تر.

١٢-تێگەیاندن و تەوبە پێ کردن لە پاش تەکفیر کردنی، پێیوستە تەوبەی پێ بکرێ جا یان تەوبە دەکا یان دەکوژرێ.

**بیروباوەڕی شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب{رحمه الله}دەربارەی عوزر بەجەهل**

شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب بەهەمان شێوە لە زانا حەنبەلیەکانە بەباشم زانی ووتەکانی بە جیاواز دابنێم:

٣٤- شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب{رحمه الله} دەڵێت:( ئەوەی باست کرد لە ووتەی شێخ{مەبەست ابن تیمیه}، هەر کەسێ پێداگری شتێ بکا ئاوا و ئاوا، وە حوجەشی پێ گەشتبێ، وە ئێوەش گومانتان هەبێ لەو تاغوطانە و شوێنکەوتوانیان، ئایا حوجەیان پێ گەیشتوە! ئائەمەلە سەیروسەمەرەکاندایە، چۆن گومانتان هەیە لەوەدا لە کاتێکدا چەندین جار ڕونم کردۆتەوە بۆتان؟!، ئەو کەسەی حوجەی پێ نەگەیشتوە بریتیە لەو کەسەی تازە موسڵمان بوە، یان کەسێ لە وڵاتێک و شوێنێکی دوور بژی لە موسڵمانان، یا لە مەسائیلە خەفیە کان، نمونە صرف و عطف، بە کافر داناندرێن هەتا نەیزانن، بەڵام ئەو بنچینەی دین کەوا الله ڕوونی کردۆتەوە و موحەکەمی کردوە لە کتێبەکەیدا، کەوا بەڕاستی حوجەی الله بریتیەلە قوڕئان، جا هەر کەسێ قوڕئانی پێ گەیشت ئەوە حوجەی پێ گەیشتوە، بەڵام بنچینەی کێشەکە ئەوەیە ئێوە جیاوازی ناکەن لە نێوان{إقامة الحجة}گەیشتنی حوجەکە و{فهم الحجة} تێگەیشتن وزانینی حوجەکە، بەڕاستی زۆرینە کافر و مونافیقان لە موسڵمانان، هەر تێنەگەیشتینە و نەزانن بە حوجەی الله لە گەڵ ئەوەی پێیان گەیشتوە، هەر وەک و الله تعالی دەفەرموێت : **(أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ**

**سَبِيلًا)[الفرقان/٤٤]**واتە:وای دادەنێن کەوا زۆرینەی ئەوکافران گوێ دەگرن وتێیدەگەن! بەڵکو ئەوانە وەک و ئاژەڵەکانن بەڵکو ئەوان لە ئاژەڵەکان زیاتر ڕێگایان بزر کردوە.، جا گەیشتنی حوجە جۆرێکە و، تێگەیشتنیش لێی جۆرێکی تر، بەڕاستی حوجە گەیشتووە وە تێگەیشتنیش بابەتێکی ترە، وە کافربونیان بە پێ گەیشتنیانەتەنها، وە ئەگەر لێشی تێنەگەن.)[الدرر السنية ج١٠ ص٩٣-٩٤]

٣٥- شیخ محمدی کوڕی عبدالوهاب{رحمه الله} دەربارەی ئەو کەسانەی هەڵە لە ووتەکانی شیخ ابن تیمیە تێگەیشتونە، دەڵێت:(وە دەربڕینی شێخی ئیسلامیش ئیبن تەیمیە کەوا بەووە حۆتان داپۆشیوە، گشتی لەمە بەهێزتری دەکا، وە ئەگەر ئێمە بڵێین زۆربەی ناودارەکان کافرن بە دیاریکراویان، تێیدا ڕاشکاوە کەوا دیاریکراو{معین} تەکفیر ناکرێت تەنها ئەگەر حوجەی پێ گەیشتبێ، وە زاندراوە کەوا گەیشتنی حوجە مانای وانییە لە ووتەی الله و رسولەکەی تێگەیشتبێ ،هاوشێوەی ئەبوبکری صدیق، بەڵکو ئەگەر ووتەی الله و رسولەکەی پێ گەیشت و عوزری بۆ خۆشی هێنایەوە، ئەوە کافرە هەروەک و کافران، هەموویان حوجەیان پێگەیشتوەبە قورئان، هەروەک و دەفەرموێت : **(إِنَّا جَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ)[الكهف/٥٧])[رسالة تكفير المعين/١١-١٢]**

٣٦- شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب دان بە مەزهەبی ئیبن تەیمیە دادەنێت لە جیاکردنەوەی لە نێوان مەسائیلی ظاهیری و مەسائیلی خەفی ـدا و دەڵیت:(ئا ئەمە سیفاتی قسەکردنیتی لەو مەسەلەیەدا لە هەموو بابەتێک لەسەر ووتەکانی وەستاوین...، وە وتەکانیشی ڕاشکاون کەوا لە گەڵ جگە لەمەسائیلی ظاهیری ـتی)[الدرر السنة ٩/٤١٨]

٣٧- شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب دەربارەی دەقەکانی شێخ لەبارەی جیاوازی کردن لە نێوان مەسائیلی ظاهیری و خەفیدا، دەڵێت:(سەیری ووتەکەی بکەن لە جیاکرنەوەی لەنێوان کارە خەفیەکاندا، وە لەنێوان ئەوەی ئێمە لەسەرین لەکوفری دیاریکراودا، وە لەدرێژەی ووتەکانیدا تەکفیری سەرەکانیان دەکا فلان و فلان بە دیاریکراویان وە وەڵامیان دەداتەوە بەوەڵامێکی خێراوە، وە لەدرێژەی ووتەکانیدا باسکردنی ئیجماع لەسەر ڕیدەی فەخری ڕازی لەئیسلامدا)[الدرر السنية ٧٢/١٠]

شێخ لێرەدا وەڵامی ئەو کەسانە دەداتەوە کەوا عوزر بۆ کەسێ دیاریکراو{معین}دێننەوە بە ناوی شێخی ئیسلام ئیبن تیمیە و ووتەکانی ئەو دەکەنە بەڵگە، جا شێخ لێرە زۆر جوان وەڵامیان دەداتەوە کەوا ئەمانە تا وەک و ئێستا لە عقیدەی شێخی ئیسلام تێنەگەیشتۆن لە جیاکردنەوەکەی لە نێوان مەسائیلی ظاهیری و مەسائیلی خفی وە جیاکردنەوەی لە نێوان گەیشتنی حوجە و تێگەیشتن و شارەزابونی حوجە، جا بۆیە لە تێنەگەیشتنی بنچینەی عقیدەی شێخ گشت ووتەکانی شێخ تێکەڵ دەکەن و تۆمەتی بۆ درووست دەکەن، نمونە لە هەندێ شوێن کە دەڵێ پێویستە کەسەکە موانعی نەبێ لەتەکفیر کردن دا یان لەوەی کە دەڵێ تەکفیر ناکرێ تا وەک و حوجەی پێ دەگات، جا هەر کەسێ لە عقیدەی شێخی ئیسلام تێگەیشتبێ لەڕوی نایێ بە عەقڵیش ئەم تۆمەتە بە مێشکی دابێنێ، وە لە پێشەوە باسی بیروباوەڕی شێخی ئیسلامیان کرد{رحمه الله}

٣٨- شیخ محمدی کوڕی عبدالوهاب{رحمه الله} دەڵێت:(ووتەتان کە دەڵێن ئێمە موسڵمانان کافر دەکەین، چۆن ئێوە ئەوقسەیە دەکەن بەڕاستی ئێمە موسڵمانانمان تەکفیر نەکردوە، تەکفیری کەس ناکەین تەنها موشریک نەبێ)[افتراءات المناولين واسماء قائليها بتفصيل ٦٢-١٦٨]

٣٩- وەدەڵێت:( وە ئەوەی دوژمنەکانم باسی لێوە دەکەن کەوا من خەڵک کافر دەکەم بە گومان یا بەدۆستایەتی، یان نەزان تەکفیر دەکەم کەوا حوجەی پێ نەگەیشتوە، ئائەمە بوختانێکی گەورەیە، دەیانهەوێت قسە بۆ خەڵکی هەڵببەستن لەسەر دینی الله تعالی و رسولەکەی)[مؤلفات الشيخ ٥/١٨٩]

٤٠- شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب لە {کشف شبهات}ـدا دەڵێت:(ئەگەر ئەوەی پێم ووتی زانیت لەدڵەوە وە شیرک ـیشت ناسی کەوا الله تعالی دەفەرموێت : **(إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَاءُ)[النساء/٤٨]** وەزانیت زۆربەی خەڵکی لە نەزانی ڕۆچون، ئەوە دوو ئیستیفادە دەکەین: یەکەمیان: دڵخۆشبون بە فەزڵی الله تعالی : **(قُلْ بِفَضْلِ اللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ)[يونس/٥٨]** وە سودێکی تریش بەهەمان شێوە ترسانێکی گەورەیە، جا گەر تۆ ئەمانەت زانی کەوا مرۆڤ کافر دەبێ بەوشەیەک لەدەمی

دەردەچێ وە ئەگەر بگۆترێت ئەمە نەزانە ئەوە عوزری نیە بە نەزانینی وە ئەگەر بڵێ ئەوە وای گومان بردیە لە الله ـی نزیک دەکاتەوە ئەوە گومانەکەی وەک و موشریکانە)[فتاوی شیخ محمد بن عبدالوهاب ١٥٥/٧]

٤١- وەدەڵێت، لەباسی موڕتەدا:(وە تێیان دایە پێغەمبەری بە درۆ خستۆتەوە و گەڕاوەتەوە سەر پەرستنی بتەکان، یان تێیاندایە دانیان بە پێغەمبەرایەتی موسەیلەمەی درۆزن دانایە گومانیان وابووە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هاوبەشە لەگەڵی لەپێغەمبەرایەتیدا، وە لەگەڵ ئەوەشدا ئیجماعی علمایان لەسەر ئەوەیە ئەوانە موڕتەدن وە ئەگەر نەزانیش بن بەمە، وە هەرکەسێکیش گومانی لە ڕیدەکەیان هەبێت کافره)[الدرر السنیة ١١٨/٨]

٤٢-وەدەڵێت:(تێبکۆشە بۆ ناسینی دینی ئیسلام، وە ناسینی الله چی بە پێغەمبەرەکەی ناردووە، وە گەڕان دەربارەی ئەوەی زانایان ووتویانە،وەک ودەفەرموێت : **(فَمَن يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ)[البقرة/٢٥٦]** وە تێبکۆشە لە زانینی ئەوەی الله تعالی فێری رسولەکەی کردوە وە ئەوەی رسول الله فێری ئومەتەکەی کردوە لە تەوحید، جا هەرکەسێ پشت بکات لەمە، الله تعالی مۆر لەسەردڵی دەدات و دونیاکەی کاریگەر دەبێ لەسەر دینەکەی وە هیچ عوزرێکی نیە بە نەزانینی)[مجموع الفتاوی والرسائل والأجوبة ١٣٦]

٤٣- وەدەڵێت:(وە زانیت کەوا ئەمە تەوحیدە کەوا پێویستترە لە نوێژ و ڕۆژوو، وە الله تعالی لەو کەسە خۆش دەبێت کەوا بەوەوە هاتبێتەوە لەڕۆژی قیامەت، وە لەو کەسە خۆش نابێت کەوا نەزانبوە ئەگەر چی کەسێکی عابیدیش بیت،.. جا گەورەیی نیعمەتی الله ـت زانی، وە بەتایبەت زانینی ئەوەت بەدەستهێنا لەوەی کەسێ بگەڕێتەوە بەردەم الله و لە تەوحیدی نەزانیبێت، یان زانیبێتی بەڵام کاری پێ نەکردبێ ئەوە لە ئاگردانە بۆ هەمیشە، وە ئەگەر چی عیبادەتیشی لە خەڵکی زیاتربێ، هەروەک و الله تعالی دەفەرموێت : **(إِنَّهُ مَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ)[المائدة/٧٢])**[مجموع الفتاوی و الرسائل والاجوبة/٨٤]

**ئەمە لە ووتەکانی شێخ بوو کەوا چەند سودێکمان تێیدا بینی**

١-شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب بۆ تەکفیر کردنی کەسی دیاری کراو مەرجی گەیشتنی حوجەی داناوە

٢-حوجە بە بەڵگەی قوڕئان و سونەت دەگات، جا هەرکەسێک بەڵگەکانی پێگەیشتبێ، ئەوە ئیقامە حوجە کرایە

٣- تێگەیشتن لەحوجەکە{فهم الحجة} مەرج نیە لە ئیقامە حوجەدا

٤-کەسی دیاری کراو ئەگەر حوجەی پێگەیشت و کەسێکی عاقڵ بێت گوێی لە حوجەکە بوبێ ئەوە تکفیر دەکرێ.

٥-جیاوازی کردنی لە نێوان مەسائیلی ظاهیری و مەسائیلی خەفی ـدا لەبابەتی تەکفیری دیاریکراو{معین}ـدا

٦-هەرکەسێ کەوتە نێو مەسەلەیەکی خەفی ناتواندرێ تەکفیری بکرێ بەدیاری کراوی تا ئەو کاتەی بەڵگەکانی پێدەگات

٧-وە دیاری کردنی شێخ لەوەی جیاوازی کردن لەنێوان مەسائیلی ظاهیری و خەفی دا لەمەزهەبی ئیبن تەیمیەیە

٨-وەڵامدانەوەی بۆ گشت ئەوانەی ووتەکانی شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە دەکەنە بەڵگە بۆ تەکفیر نەکردنی کەسی دیاری کراو، شێخ محدی کوڕی عبدالواهاب ڕونی دەکاتەوە لە خەراپی و هەڵەیی ئەو تێگەیشتنەی ئەوان لەم دەقانەدا

٩-ڕونکردنەوەی شێخ لەبارەی ووتەکانی ئیبن تیمیە کەوا ووتەکەی،لەتەکفیر نەکردنی کەسی دیاری کراو لەبۆ جگە لە مەسائیلی ظاهیریە، بەڵکو ئەمانە لەمەسائیلی خەفیدان

١٠-وە شێخ تەکفیری کەسی دیاری کراوی کرد و هیچ عوزرێکی بە نەزانینی بۆ نەهێنایەوە، تەنها لەو حاڵەتە دیاری کراوانەی مەسائیلی خەفی نەبێ

١١-هەرکەسێ پشتهەڵبکات لە فێربون لە تەوحید ئەو کەسە هیچ عوزرێکی بۆ نیە

١٢-وە ئەو کەسەی نەزانە بە تەوحید هیچ عوزرێکی بۆ نیە.

## هەڵوەشاندنەوەی گومانەکان

لەم بابەتە کەوا نەقڵی بەڵگەکانی قورئان وسوننەتمان کرد وە هەروەها ئیجماعی موسڵمانان لەسەری، جا ئەهلی ئەهواء وەک و پیشەی هەمیشەییان بەدوای گومان دەگەڕێن و دەیانهەوێت بە گومان باطڵەکانیان سەربخەن، بەڵام هەمیشە سەرشۆڕ و دۆڕاوە، جا کاری ئەمان ئەوەیە شوێن ئەو بەڵگانە دەکەون کە زۆرمانادەدا و بەگومانە ئەمانیش گومانی خۆیان تێدا دەخەن دەیکەن بە بەڵگە بۆ باطڵیەکەیان کەوا ئەوەی بۆ خۆیان دەیکەن بە بەڵگە هیچ پەیوەندیەکی بەم بابەتەیانەوە نییە، بەڵام ئەوان پیشەکەیان وایە و وا بەردەوامن لە گەڵی، دایکە عائیشە عائیشە(رضي الله عنه) دەڵێت: رسول الله صلى الله عليه وسلم ئەم ئایەتەی خوێندەوە(**هُوَ الَّذِي أَنزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُّحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ..... ال عمران/٧**) واتە: ئەو خودایەی کە کتێبەکەی بۆ تۆ ناردۆتە خوارەوە، بەشێک لە ئایەتەکانی ڕوون و ئاشکران ئەوانە بناغەی قورئانەکەن، هەندێکی تریش جیاوازی هەڵدەگرن و بەئاسانی مانایان نازاندرێت، ئەوانەی دڵیان لار بۆتەوە لە ڕێی ڕاست شوێن ئەو ئایەتانە دەکەون کە مانای جۆراوجۆر هەڵدەگرن، بۆ ئەوەی فیتنە و ناکۆکی درووست بکەن، یان بۆ ئەوەی لێکدانەوەی هەڵەی بۆ بکەن، کەسیش لێکدانەوە و مانای ئەو بەڵگە و نیشانانە نازانێت تەنها خودا نەبێت، وە ئەوانەی ڕۆچوون لە زانست دا دەڵێن: ئیمان دێنین هەر چی لەلایەن پەروەردگارمانەوە بێت، کەسیش بیر لەوە ناکاتەوە تەنها خاوەن ژیریەکان.، عائیشە ووتی:(پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: ئەگەر ئەوانەتان بینی کە دوای ئەم ئایەتانە دەکەون و کە مانای جۆرا و جۆر هەڵدەگرن، ئائەوانە ئەو کەسانەنە کە خودا ناوی بردوون، جا خۆتانیان لێ بپارێزن)[مسلم، بخاري/٤٢٧٣]

ئەمە سیفات و کاری ئەهلی ئەهواءـە شوێن ئایەتە موتشابهەکان دەکەون و بە عەقڵە پوچەکانیان و نەفسە پیسەکانیان پێناسە و دەستکاری دەکەن، بەڵام ئەهلی حەق شوێن ئەوە دەکەوێت کەوا چۆن لەلایەن پەروەردگارەوە هاتبێت، بەڕاستی ئەهلی ئەهواء وایان لێ هاتووە دەستکاری ئایەتە محکەمەکانیش دەکەن و دەیگۆڕن و بە جۆرێکی تر پێناسەی دەکەن و باسی لێوە دەکەن، جا خۆیان گومڕا بوون و تاکە ئامانجیشیان ئەوەیە فێرخوازان علم لە ڕێگا

لابدەن و بیانهێننە سەر ئەهواءـو بیدعەکانیان و لە گەڵ خۆیان گومڕای بکەن، جا هەر وەک و رسول الله صلی الله علیه وسلم ئەمری پێمان کرد پێویستە لە سەر گشت موسڵمانێ دوور کەوێتەوە لێیان و خۆی لێیان بپارێزێ بە هەموو شێوەیەک بەڕائەتی خۆی دەرببڕێ لە بەرامبەریان، چونکی بەڕاستی ئەمانەی الله تعالی ناوی هێنان ئەوانە لە ئەهلی ئەهواء ـن لە گروپ و تاقمە موڕتەدەکانی بەناو ئیسلام بانگەشەی لێوە دەکەن، جا ئەو گومانانەی لەم بابتانەی دروستیان کردوە و دەیکەنە بەڵگە بۆ ئەم بیروباوەڕە باطڵەیان، دەچینە سە وەڵامەکانیان و پەردە لەسەر ئەوگومانانە هەڵدەدینەوە و نایانهێڵین ان شاءالله تعالی.

## گومانی یەکەم : ئەم بەڵگانە تایبەتن بە کافری ئەصلی

دەڵێن: ئەم ئایەتانەی باسیان لێوە دەکەن دەربارەی کافری ئەصڵیە، نەوەک دەربارەی ئەوانەی بیت کە موسڵمان بونە و دەکەونە نێو شیرک و کوفر !!..

لە وەڵامی ئەم قسە باطڵە دا دەڵێین:{عیبرەت بەگشتی ووتەکەیە نەوەک بە تایبەتی هۆکارەکەی}وە الله تعالی حوکمیانی جودا نەکردۆتەوە بەڵکو حوکمەکانی الله تعالی گشتگیرن، جا کافری ئەسڵی تێیداتێبکەوێ یان موسڵمان بێت و پاشان بکەوێتە نێو کوفر و شیرکێک ئەوە هەمان حوکمیان هەیە، وە الله تعالی قوڕئانی دابەزاندوە بۆ گشت خەڵک و جینێک و حوکمەکانی کوفر و ئیمانی دیاری کردوە،الله عز وجل دەفەرموێ(**وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ)[سبأ/٢٨]**واتە: تۆمان بۆ گشتی خەڵکی ناردوە تا مژدەدەر و ترسێنەر بی، بەڵام زۆرینەی نازانن.، جا ئەو مژدەیە بۆ ئیماندارانە چ کافرێکی ئەسڵی ئیمان بێنێ و موسڵمان بێ، چ کافرێکی هەڵگەڕاوە دوبارە بێتەوە ناو ئیسلام و ئیمان بێنێ، بەهەمان شێوە ترساندن و ئاگادارکردنەوەکەی بۆ گشت کەسێکە چ کافری ئەسڵی بێ چ ئیماندار بێ و هەڵگەڕێتەوە و بکەوێتە نێو کوفر و شیرکێ، وەدەفەرموێت:(**وَأَنْ أَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الْمُشْرِكِينَ)[یونس/١٠٥]** واتە: ئەی محمد بەڕاستی ڕوی خۆت بکە ئاین ودینداری،و لەموشریکان مەبە.، الله تعالی لێرەدا بەرسول الله دەفەرموێ ڕوی خۆت لە دینی الله تعالی بکە، گەر ڕوی لە دینی الله نەکرد و لایدا لە شتێ یا

لەهەموی(**وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الْمُشْرِكِينَ**) ئەوا لە موشریکان مەبە، هەرکارێک بکرێت شیرک بێت هەرکەسێ بیکات کافری ئەسڵی بێ یان ئیماندارێ پاشان ئەو کارە بکا پێی کافر دەبێ و لە دین دەچێتە دەرەوە، شیرک هەر شیرکە جێگیر بونی شیرکەکە لە سەرخاوەنەکەی تایبەت نەکراوە بە کافری ئەسڵی بەڵکو هیچ جیاوازیەک نیە لە هەرکەسێ بکەوێتە نێوی ناوی و سیفاتی شیرکەکەی بەسەردا جێگیر دەبێ، وە دەفەرموێت : (**وَدُّوا لَوْ تَكْفُرُونَ كَمَا كَفَرُوا فَتَكُونُونَ سَوَاءً**)[**النساء/٨٩**] واتە: دەیان هەوێت کافرتان کەنەوە هەروەک و خۆیان کە کافرن ئەوکات وەک و یەکترتان لێبێت.، جا لێرەدا الله تعالى بەئیمان داران دەڵێ و ئاگاداریان دەکاتەوە لەوەی کافربن وەک و ئەوانیان لێدێ و یەکسان دەبنەوە لە کوفری، کوفر کەسی تایبەت نەکردوە بە خۆی بەڵکو کۆمەڵێ کاری تایبەت کردوە بەخۆی هەرکەسێ کارێ لەو کارانە بکات ئەوە کافر دەبێ، جا موسڵمان بێت بیکات یان کافری ئەسڵی بێ، الله تعالى دەفەرموێت: (**وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ نَسُوا اللَّهَ فَأَنسَاهُمْ أَنفُسَهُمْ**)[**الحشر/١٩**] واتە : وەک و ئەوانەش مەبن کە الله ـیان لەبیر کرد و جا الله ـش وای لێکردن خۆیان لەبیر بکە.، وە دەفەرموێت : (**وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ قَالُوا سَمِعْنَا وَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ**)[**الأنفال/٢١**] واتە: وەک و ئەو کەسانەش مەبن کە گوتیان گوێبیست بوین لەڕاستی دا ئەوان گوێناگرن.، وەدەفەرموێت: (**وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ**)[**المائدة/٥١**] واتە: جا هەر کەسێ ئەوان بکاتە یاوەری خۆی ئەوە لەوانە.، جا حوکمەکان گشت گیرن و هیچ جیاوازیەکی تێدا نیە بەڵکو هەرکەسێ وای کرد ئیدی لە کافران لەموشریکانە، هەروەک و رسول الله صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ:{من تشبه بقوم فهو منهم}واتە هەرکەسێ شتی بچوێنێ بەوان ئەوا لەوانە.، جا ڕاستە کافرانی ئەسڵی بەڵێ دەیانگرێتەوە بەڵام گەر موسڵمانان لە پاش ئیمانهێنانیان شتێکی هاوشێوەی ئەوانیان کرد لە کوفر و شیرک ئەوە لەوانن و پێی کافر دەبن و دەردەچێ لەدین، نەوەک هیچ جیاوازیەکی تێدا بکرێ، جیاوازی کردن تێیدا بریتیە لە عقیدەیەکی کوفری و ئەوپەڕەی نەزانینی کەسەکە کە وابڵێت.، ئیبن تیمیە {رحمه الله} دەڵێت:( موسڵمان ناڵێت ئەم ئایەتە ئاشکرایە هیچ کەس ناچێتە ناوی تەنها ئەوسی کوڕی صامت وە ئایەتی لەعنەت ناچێتە ناوی تەنها عاصمی کوڕی عەدی نەبێ یان هیلالی کوڕی ئومەییە: وە باسکردنی کافران کەس ناچێتە ناوی تەنها کافری قوڕەیش، وە هاوشێوەی ئەمانە کەوا موسڵمان و کەسی عاقڵ ئەو

قسەیە ناکەن، بەڕاستی رسول الله صلی الله علیه وسلم دەیزانی کەوا بە پێویستی لە دینەکەی نێردراوەبۆ گشت مرۆڤەکان و جنەکان، وە الله تعالی لە قورئان دەربارەی گشت مروف و جنەکان قسەدەکات، وەک و دەفەرموێت: **{أُنذِرَكُم بِهِ وَمَن بَلَغَ}**جا گشت کەسێ قورئانی پێگەیشت لە مرۆڤ و جن ئەوە بەڕاستی ئاگادار کراوەتەوە لەلایەن رسول الله ـوە)[مجموع الفتاوی-١٦/١٤٨]شیخ عبدالله ـی کوڕی عبدالرحمن ئەبا بطین{رحمه الله} دەربارەی ئەم گومانە پوچەڵە دەڵێت:(وە ئەم ووتەیەش کە دەڵێن: ئەو ئایەتانەی دابەزیون بە حوکمدان لەسەر موشریکانی سەرەتایی ئەوە تێکەڵ ناکرێت ئەو کردەوانەیان بە کردەوەی ئەوانەوە، ئائەمە کوفرێکی گەورەیە)

## گومانی دووەم : گوماندروستکردن بە تکفیری {مطلق} و {معین}

بۆ شەڕعاندنی باطڵەکانیان دێن و وا دەیڕازێننە و وا بۆخۆیان دەکەنە قاعیدە کەوا دەڵێن: کە الله تعالی دەڵێ ئەمە حوکمە و هەرکەسێ نەیکات یان بیکات کافرە ئێ ئێمەش دەڵێین ئەوەی وا بکات کافرە، بەڵام بە دیاری کراوی ئەگەر کەسەکە کەوتە ناو ئەم کوفرە پێی ناڵێین کافرە..!!

پەنادەگرین بە رب العالمین لەم جۆرە بیرکردنەوە گومڕاییە گەر ئایەتێکیان بە دڵ بوو عەقڵ و عاطیفەی دڵیان ڕێگەی دان کەسەکە تەکفیر بکەن ئەوە دەڵێن کافرە ئەگەر چی هیچ بەڵگەیەکیشیان لەدەست نەبێت، بەڵام گە عەقڵە پوچەکانیان ڕێگای نەدان و قەبوڵی نەکرد ئەو کەسە بەکافر بزانن لەگەڵ ئەوەی بەڵگەشیان هەیە نەفسە پسەکانیان زاڵ دەکەن بەسەر حوکم و بەڵگەکانی الله تعالی، جا ڕاستەوخۆ ناڵێن ئێمە نەفسمان لا خۆشەویسترە بۆیە وادەکەین، نا دەیانهەوێ بێن و بۆ خۆیان بیکەنە گومان و بڵێن ئێمە باوەڕمان بەم بەڵگانە هەیە ئەم کارە کوفرە و کەسێ بیکا کافرە، بەڵام ئەگەر کەسەک ئەم کارەی ئەنجام دا ئەوە ناڵێین کافرە..!!گەر لێشیان بپرسی بۆچی بە دیاری کراوی ناڵێن فلانە کەس کافرە بوە؟ دەڵێن: کەسەکە موانع و ڕێگری هەیە! دەڵێین ئەم ڕێگریانەی چین؟ دەڵێن: جهل تۆویل خطاء..!!!نە لەمانا و حوکمی جاهیل تێگەیشتون وە نە لە ناو حوکمی تئویل و ئیجتیهاد و

خطاء ـەکەشیان، بەڵکو هەرکەسێ کەوتە ناو جەهلەوە هەرجۆرە شتێ بێ لای ئەوان نوع بنچینەیە لەبۆ تەکفیر و نەکردنی بەڵام سبب ـیان لاداوە! کەوا سەبەب کەسەکان لە ئیمان دێنێتە دەرەوە بەرەو کوفر، نەوع ـەکە دەڵێن جەهلە ئیدی نابێ تەکفیر بکرێ یان نەوعەکەی تئویلە نابێ یان گەورەترین هەڵەیان هاتوون (خطاء) هەڵەیان تێکەڵ کردوە لە گەڵ بابەتی جەهل و تئویلا!! بەڵام لە یەک شت پێکاویانە ئەویش لە مەسەلەی ئیکراهـ.

جەهل: بەڵگەکانمان لە قورئان و سوونەت و ئیجماع نەقڵ کرد لەوەی جەهل عوزری بۆ نیە، بەڵام لەو مەسائیلانەی کەوا شاراوەن و خاوەنەکەی ناتوانێ جەهلەکەی بەرزبکاتەوە بەرەو علم ئەو کاتە ئەو کەسە ڕێگری دەبێ، بەڵام لەمەسائیلەکانی بنچینەی دین و ظاهیریەکان هیچ کەس ڕێگریەک و مەرجێکی نابێ بۆ حوکمی کوفر لەسەر دانی، کەوا زۆر بەڕوونی بەسەر گشتی دا ڕۆشتین پێویست ناکات دوبارە بەسەری دابچینەوە، حەتمەن ئەو کەسەی ئێرە دەخوێنێتەوە لە پێشتر تێگەیشتوە و وەڵام گومانی جەهلی وەرگرتوە تەئویل: بە هەمان شێوەی جەهل دەبێتە دوو بەش:

یەکەم : تەئویل لە مەسائیلی بنچینەکانی دین و ظاهیری: لێرەدا تەئویل بە هیچ شێوەیک بۆ خاوەنەکەی نابێت بە عوزر و نابێتە ڕێگر بۆی بەڵکو هەرکەسێ تئویل بکات لە هەر یەکێک لەناو ئەم مەسائیلانە ئەوە ڕاستەوخۆ ناوی و سیفاتی کوفری بەسەردا جێگیر دەبێ پاشان تەوبەی پێ دەکرێ گەر کردی گەر نا دەکوژرێت، تەئویل ـبە بەشێکە لە جەهل بەشێکی زۆری جاهیلەکان توشی تەئویل دەبن، جودا لەوەی کەسەکە دەزانێ بەم تەئویلە و پێداگری لێ دەکا کەوا لەگەڵ جەهلەکەدا یەکن، جا گەر بگەڕێنەوە بۆ بەڵگەکان دەبینی زۆرینەیان تەئویلیان هەیە و لێکدانەوەیەکی هەڵەیان کردوە لە جۆرەکانی پەرستندا ئەمەش بەهۆی جەهلەکەیان توشیان هاتووە و کەوتونەتە ناوی، یان کەسانێک مقلیدن و شوێن تەئویلی کەسانێکی تر کەوتوون، جا دەبینین کەوا اللّٰه تعالی عوزری بۆ ئەم جاهیلانە نەهێناوەتەوە کەوا کەوتنەتە نێو کوفر و شیرک بە هەرجۆرێکی تەئویل یان نەوعی ـتر بێت

دووەم: تەئویل لە مەسائیلە شاراوەکان: بەهەمان شێوەی جەهل لە مەسائیلی شارەوەدا وەک و لەسەروەش باسمان کرد تەئویل هەر بەشێکە لە جەهل، لەو مەسائیلانەی شاراوەن

بەجۆرێک خاوەنەکەی نەتوانێ، مانای نەتوانینیش ئەوەیە کەسەکە لە هەوڵدان و تێکۆشان بۆ گەیشتن بە وەڵامەکەی دەست ی نەکەوێ و تەئویل تێیدا بکات، تەبعەن ئەمەش لەبەر شاراوەیی مەسائیلەکەیە و بە گرینگ دانەنایەتی، جا هەر کەس لەم مەسائلی شاراوە تەئویلی کرد حوکمی کوفری بەسەرا نادرێت، ئەمەش دەبێ دوو مەرجی تێدا بێتە جێ گەر نا عوزری تێدا قەبوڵ ناکرێت:

یەکەم: پوچەڵ نەکردنەوەی بنچینەی بابەتە شاراوەکەی تێیدا تێکەوتووە، واتا ئەو شتەی تەئویلی تێدا دەکات حوکمێکی شاراوە بێت و واش نەبێت بابەتەکە گشتی پوچەڵ بکاتەوە یان بنچینەکەی بەڵکو دەبێ بەشێک لێی، گەر نا عوزری لێ قەبوڵ ناکرێت، بەڵگەش لەسەر ئەمەدا بەسەرهاتی قودامەیە ڕەحمەتی الله تعالی ـلێ بێت، کەوا زۆرێک لەوانەی عوزر بۆ جاهیل دێننەوە لە مەسائیلەکانی بنچینەی دین و ظاهیریەکان ئەم بەسەرهاتە دەکەنە بەڵگە جا لە گومانەکانی تر دێینە سەر ئەمەش لەوێ بە ڕوونی باسی لێوە دەکەین بإذن الله

دووەم : کەسەکە شوبهە و گومانێکی هەبێت، واتا ئایەتێکی قورئان یان فەرمودەی رسول ﷲ ـی لابێت و بیکاتە بەڵگە بۆ خۆی، جا مەرجی سەرەکیش لەمەدا بابەتەکە شاراوە بێ زاندراو نەبێ و لەبابەتەگرینگەکان نەبێت، جا ئەمەشیان حوکمی کوفری بەسەردا نادرێت تا ئەو کاتەی بۆی ڕون دەکرێتەوە و گومانەکەی دەسڕێتەوە و ناهێڵدرێ لەلای پاشان گەر پێداگیری کرد دەکوژرێت، هەروەک و لەبەشی مەسائیلی خفی پێشتر باسمان لێکرد و ڕونبوو. جا بابەتی تەئویل کەو دەبێتە مەرجێک و ڕێگریەک بۆ تەکفیر پێویستی بەم چەند مەرجـە هەیەلە بابەتی تەئویل دا و بە چ شێوەیەک، نەوەک بە ڕەهایی هەر کەس تەئویلی کرد عوزری بۆ بهێندرێتەوە بە ناوی موانع، نەخێر هەر کەسێ کەوتە نێو هەر بابەتێکی توحید و ئیمان و شیرک و فەڕزەکان و حەڕام کراو حەڵاڵ کراوەکان و....هتد،، تەئویل و جەهل تێیدا ناخوات بەڵکو هەرکەسێ بکەوێتە ناو کارەکەی ڕاستەوخۆ بەسەردا جێگیر دەبێ و کافرە.

خطاء: هەڵەکردن، جیاواز لە جەهل و جیاواز لە تەئویل وبابەتەکانی تر، بەڵکو کەسەک زانا بێت بەکارەکە وە کەسەکە بیروباوەڕی بەو کارە هەڵەیەی نەبێت وە ئەو کاتەی کە هەڵەکەی کردوە پێی بڵێین وات کردوە! بڵێت: کەی شتی وام ووتوە، واتا کەسەکە ئاگاداری خۆی نەبێت

و عەقڵی لەسەر خۆی نەبێت، هەر وەک و الله تعالی دەفەرموێت : **(رَبَّنَا لاَ تُؤَاخِذْنَا إِن نَّسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا)[البقرة/٢٨٦]**واتە: ئەی پەروەردگارمان لێمان مەگەر گەر بیرمان چوو یان هەڵەمان کرد.، وە رسول الله صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت:(الله تعالی ڕێگای بە ئومەتەکەم داوە لە هەڵە و بیرچون و زۆریلێکردن)[رواه البيهقي وابن ماجه] وە فەرمودەی بەسەرهاتی ئەو پیاوەی کەوا ڕێبوار بوو کەوتە ناو توێنێتی و برسیەتی و تەواو نائومێد کاتی خەوت و هەستایەوە خواردن و خواردنەوەی لەلا بوو ئەوەندە دڵ خۆش بوو زمانی هەڵەی کرد و ووتی:(یاالله تۆ عەبدی منی و من خودای تۆ)[متفق علیه] کەسەکە هەڵەی کرد وە بەنقەست وای نەکرد، جا مەرج لە هەڵە ئەوەیە کەسەکە بەنقەست نەبوبێ واتا علمی بەکارەکە هەیە و ڕکی لێ دەبێتەوەوە نایکا بەڵام کارێکی توش دەبێ لە عەقڵ و توانای ئەو دەردەچێ نە ئاگاداری عەقڵی دەبێ ئاگاداری خۆی نیە نە جەستەشی، هەر وەک و الله تعالی دەفەرموێت : **(ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ اللَّهِ فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوا آبَاءَهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ وَمَوَالِيكُمْ وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَا أَخْطَأْتُم بِهِ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا)[الاحزاب/٥]** واتە:لەلای الله ـدا ڕەواترە ئەو منداڵانە بەناوی باوکیان بانگ بکرێن، جا ئەگەر باوەکەکانیان نەناسن ئائەوانە برای ئاینی و دۆستی ئێوەن، تاوانیشتان لەسەر نیە ئەگەر بەناوی باوکەکانیانەوە بانگیان نەکەن، بەڵام نابێت دڵەکانتان بە ئەنقەست ئەم کارانەتان پێ بکات، الله تعالی ـیش لێبوردەوەو بەبەزیەوە.،جا حەقیقەتی مەرج و ڕێگریەکانی تەکفیر ئاوایە بەڵام کێشەی ئەوان لە تێنەگەیشت و ضبط نەکردنی بابەتەکەیە و شوێن گومانەکان کەووتون، لە کاتێک دا بەڵگەکان زۆر ڕوونن کەوا کەسێ مەرجی بۆ داندرابێ تەکفیر نەکرێت الله تعالی خۆی ڕونی کردۆتەوە، کەوا باسمان کرد لە کەسی مکرهـ وە هەروەها کەسی غیر مکلف وە خطاء کەوا جۆر و شێوەکانمان بەبەڵگەی قوڕئان دانا، جا گەورەترین هەڵە لەوەدایە ئەم مەرجانە بە ڕەهایی وەربگیرێن و تێکەڵ بکرێ و لە سنوری شەرع دەربچن و گومڕا ببن لە ڕێگای الله تعالـی، جا کێشەی گەورەی ئەمانیش لەم مەرج و ڕێگریانە جیانەکردنەوەیانە لە نێوان مەسائیلی ظاهیری و مەسائیلی خەفی و مەرجەکانی، وە جیاوازی نەکردنیان لە مەسائیلی أسماء و أحکام ـدا، هەر وەک و شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب{رحمه الله} دەربارەی ئەوکەسانە قسە دەکات کەوا ئەم بابەت و مەسائیلانەیان

تێکەڵ کردوە هەڵە لێی تێگەیشتون و ووتەکانی شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە دەهێننەوە کەوا لێی تێنەگەیشتوون و لە وەڵامیان دەڵێت:( چۆن گومانتان هەیە لەوەدا لە کاتێکدا چەندین جار ڕونم کردۆتەوە بۆتان؟!، ئەو کەسەی حوجەی پێ نەگەیشتوە بریتیە لەو کەسەی تازە موسڵمان بوە، یان کەسێ لە وڵاتێک و شوێنێکی دوور بژی لە موسڵمانان، یا لە مەسائیلە خەفیە کان، نمونە صرف و عطف، بە کافر داناندرێن هەتا نەیزانن، بەڵام ئەو بنچینەی دین کەوا الله ڕوونی کردۆتەوە و موحەکەمی کردوە لە کتێبەکەیدا، کەوا بەڕاستی حوجەی الله بریتیەلە قورئان، جا هەر کەسێ قورئانی پێ گەیشت ئەوە حوجەی پێ گەیشتوە، بەڵام بنچینەی کێشەکە ئەوەیە ئێوە جیاوازی ناکەن لە نێوان{إقامة الحجة}گەیشتنی حوجەکە و{فهم الحجة} تێگەیشتن وزانینی حوجەکە، بەڕاستی زۆرینە کافر و مونافیقان لە موسڵمانان، هەر تێنەگەیشتینە و نەزانن بە حوجەی الله لە گەڵ ئەوەی پێیان گەیشتوە، هەر وەک و الله تعالی دەفەرموێت : **(أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا)[الفرقان/٤٤]**واتە : وای دادەنێن کەوا زۆرینەی ئەوکافران گوێ دەگرن وتێیدەگەن! بەڵکو ئەوانە وەک و ئاژەڵەکانن بەڵکو ئەوان لە ئاژەڵەکان زیاتر ڕێگایان بزر کردوە.، جا گەیشتنی حوجە جۆرێکە و، تێگەیشتنیش لێی جۆرێکی تر، بەڕاستی حوجە گەیشتووە وە تێگەیشتنیش بابەتێکی ترە، وە کافربونیان بە پێ گەیشتنیانەتەنها، وە ئەگەر لێشی تێنەگەن.)[الدرر السنية ج١٠ ص٩٣-٩٤]وە هەروەها شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب لە وەڵام و تێگەیاندن لەم مەسائیل و مەرج و ڕێگریانەـدا دەڵێت:(وە مەسەلەی تەکفیری دیاری کراو بابەتێکی زاندراوە، بەڵام ئەو کەسەی حوکمی کوفری لەسەر نادرێت تا ئەو کاتەی حوجەی پێ دەگات کەوا نەکەرەکەی کافردەکات ئەمە لە لەمەسائیلە شاراوەکانە کەوا لەبەشێک شاردراونەتەوە.، بەڵام ئەوەی کەوتۆتە نێو مەسائیلە ظاهیریەکان یان ئەوەی زانینی بە گرینگ دانراوە ناوەستین لە تەکفیرکردنی بکەرەکەی)[الدرر السنية ٨/٩٠] وە شێخ ابا بطین دەڵێت:( بانگەشەی ئەوە دەکەن کەسێ کەوتۆتە نێو کوفر تەئویلی هەیە یا موجتەهیدە یان هەڵەکارە یان مقلدە یا نەزانە عوزری بۆ هەیە، بەڕاستی ئەمە جیاوازە لە قورئان و سوننەت و کۆدەنگی زانایان بەبێ هیچ گومانێک، لەگەڵ ئەوەی هەڵوەشێنەرەوەیەکی لەبنچینەیەکداهەبو ڕەتی کردەوە کوفرە بە بێ گومان هەر وەک و ناوەستین لە تەکفیری

هەرکەسێ گومانی لە پەیامی محمد هەبێ صلى الله عليه وسلم وە هاوشێوەی ئەمانیش)[الدرر السنية ٧٢/١٢] وە هەروەها دەڵێت:( لە تەکفیری دیاری کراودا کەوا ئایەت و فەرمودەکان و ووتەی زانایانی لەبارەوە ئاشکرایە بەڵگەن لەسەر کوفری ئەوەی شیرک بۆ الله دادەنێ وە جگە لەو پەرستنی بۆ دەکا، جا هیچ جیاوازیەک ناکرێت لەبەڵگەکان لە نێوانی دا لە دیاری کراوی(معين) و جگە لەویش(مطلق) هەر وەک و الله تعالى دەفەرموێت : **(إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ )[النساء/٤٨]**وە دەفەرموێت : **(فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ)[التوبة/٥]** ئائەمانە گشتینە بۆ هەریەکێکی موشریک، وە گشتی زانایان لە کتێبە فقهـیەکانیاندا باسی حوکمی موڕتەدیان کردوە وە یەکەم شتکەباسیان لێوە کردوە لە جۆرەکانی کوفر و ڕیددە و شیرک دەڵێن: هەرکەسێک شیرکی بۆ الله دانا کافرە وە عوزری نەزانینی بۆ ناهێندرێتەوە، وە هەرکەسێکیش پێی وابێت الله تعالى هاوەڵی هەیە یا منداڵی هەیە کافرە و عوزری نەزانینی بۆ ناهێندرێتوە، وە هەرکەسێ قسە بە دایکەعائیشە بڵێت کافرە، وە هەرکەسێک گاڵتە بە الله و پەیامەکەی و کتێبەکەی بکات کافرە بە ئیجماع بە ووتەی الله تعالى:(لا تعتذروا قد كفرتم بعد إمانكم)وەباسی جۆری زۆر تریان کردوە کەوا کۆدەنگن لەسەر کوفری خاوەنەکەی و هیچ جیاوازیەک ناکەن لە نێوان دیاری کراو(معين) و جگە لەویش(مطلق) پاشان دەڵێن: هەرکەسێ لە ئیسلام هەڵگەڕێتەوە دەکوژرێت لە پاش داوای تەوبە لێکردنی، حوکمی بە ڕیددەکەی دا بەر لەوەی داوای تەوبەی لێبکات، وە داوای تەوبە کردنیش دوای حوکم دانە با ڕیددە، وە داوای تەوبەش تایبەتە بە کەسی دیاری کراو، وە باسی ئەوەشیان کردوە هەرکەسێ پێداگری بکات لە واجب بونی یەک عیبادەتی پێنجەکە یان شتێ حەڵاڵ بکا لە حەڕامەکان وەک و مەشڕوب و گۆشتی بەراز و هاوشێوەی ئەمانە وە هەرکەسێک گومانی لەوە هەبێت کافرە وە ئەگەر چی نەزانیش نەبێت، وە لە شیرک و هاوشێوەی دا ناڵێین لەوەی باسان کرد تەنها ڕەهای و گشتیـ(مطلق)ـە بەڵکو نەزانینی بۆ ناهێنینەوە وە جیاوازی ناکەین لەنێوان کەسی دیاری کراو و جگە لەویش، هەروەک و باسان کرد داوای تەوبە کردن تایبەتە بە دیاریکراو،،جا ئایا درووستە بۆ موسڵان گومانی هەبێت لە کوفری هەرکەسێک بڵێت الله تعالى هاوڵە و منداڵی هەیە؟ یان بڵێت جوبڕائیل هەڵەی کردوە لە پەیامەکەی؟ یان پێداگری هاتنی بکات لە پاش مردنی یان پێداگری لە یەکێک

لەپێغەمبەران بکات؟ جا ئایا موسلمان جیاوازی دەکات لەدیاری کراو و جگە لەویش؟ بەڵکو رسول الله صلى الله عليه وسلم دفەرموێت:(هەرکەسێ دینەکەی گۆڕی بیکوژن)وە ئەمەش دیاری کراو جگە لەویشە)[الدرر السنية ١٠/٤٠١]جا ووتەی ئەهلی عیلم زۆرن لە وەڵامدانەوەی ئەم گومانە پوچەڵەی کەوا هەرئێستا نیە بەڵکو لەسەلەفەوە تاوەکو خەلەف ئەم ووتە و بیروباوەڕانە هەبونە و ڕووبەڕویان بونەتەوە و وەڵامیان دراوەتەوە، جا هەرکەسێک الله تعالى گومڕای کردبێ کەس ناتوانێ هیدایەتی بدات.

## گومانی سێیەم: ئەو پیاوەی داوای کرد لەپاش مردنی بیسوتێنن

گومانی : ئەو پیاوەی بە کەسوکارەکەی ووت بمسوتێنن

لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕتەوە،لە ڕەسول الله (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی :- (پیاوێک خێری زۆر کەم کردبوو، لەسەرە مەرگ دا بە کەس و کارەکەی گووت ئەگەر مردم بمسوتێنن و پاشان نیوەم بکەنە وشکانی و نیوەکەی تریشم بخەنە دەریاوە، واللە ئەگەر الله توانای هەبێ لە سەرم بە جۆرێک سزام ئەدات کە کەسی ئەوها سزا نەدابێت، کاتێک کابرا مرد چۆنی ووت ئاوهایان لێ کرد، الله فەرمانی کرد بە وشکانی ئەوەی تیای بوو کۆی کردەوە و فەرمانی بە دەریا کرد ئەوەی تیای بوو کۆیکردەوە، پاشان پێی فەرموو بۆ وات کرد؟ ووتی: لە ترسی تۆ پەروەردگار خۆشت زاناتری، لێی خۆش بوو).

دەڵێن:(ئەها سەیرکەن چۆن عوزری پێدرایە لە گەڵ ئەوەی نەزان بوە و کەوتۆتە نێو کوفرەوە و باوەڕی بە توانای الله و زیندوو بونەوە نەبووە بەڵام الله تعال لێی خۆش بووە...!!) دەڵێین: زۆر بە هەڵە لەم فەرمودەیەی رسول الله صلى الله عليه وسلم تێگەیشتونە و کەوتونەتە گومانەوە، وە ڕونکردنەوەی ئەم فەرمودە و وەڵامی ئەم گومانەش لە چەند خاڵێک دەیخەینە ڕوو:

یەکەم : ئەم فەرمودەیە لە دەرەوەی ئەم ناکۆکیەیە کەوا ئەوان  باسی لێوە دەکەن و دەیکەنە بەڵگە بۆخۆیان و موشریکان، بەڵکو ئەو پیاوە کەسێکی موەحید بوو دانی دەنا بە تەوحید و دوور بوو لە شیرک و نەزانین لێ

هەر وەک و لە مسندی ئیمامی احمد هاتووە

لە حەدیثی ئەبو هوڕەیرە دەڵێ:( لەرسول الله ـوە صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ:پیاوێ لەوەی لەپێش ئێوە بوون، هیچ کردەوەیەکی نەکردبوو تەنها تەوحید نەبێ، کاتێ سەرەمەرگ بە کەسوکارەکەی ووت: سەیرکەن ئەگەر مردم بمسوتێنن تا دەبتە ئاگراوێک، پاشان بمهاڕن و لەڕۆژێکی بادا بڵاوی بکەنەوە، کاتێ مرد وایان لێ کرد، ئەوە لەبەر توندی الله تعالی بوو لەسەری، الله عز وجل لێی لێی پرسی: ئەی نەوەی ئادەم چیوای لێ کردی ئەم کارەبکەی ووتی: ئەی پەروەردگار لە ترسی تۆ الله تعالی فەرموی: لێی خۆش بووم و هیچ خێرێکی نەکردبوو تەنها تەوحیدی هەبوو)[المسند/٨٠٤٠]

وە لە حەدیثی عبدالله کوڕی مسعودەوە(رضي الله عنه):(پیاوێک هیچ خێرێکی نەکردبوو تەنها تەوحید نەبێ، کاتێ گەشتە سەرەمەرگ بە کەسوکارەکەی ووت: ئەگەر مردم بمگرن بمسوتێنن و بمکەنە ئاگراوێک پاشان بمهاڕن و پاشان لە ڕۆژێکی بادا لەسەر دەریا بڵاوی بکەنەوە،ووتی: ئینجا وایان لێکرد، ووتی: لە لەبەر توندی الله، ووتی:الله عزوجل پێی ووت: چی وای لێ کردی وابکەی ووتی: لە ترسی تۆ ووتی : الله تعالی لێی خۆشبوو)[المسند/٣٧٨٥]

ئیمام حافظ ـی کوڕی عبدالبر{رحمه الله} دەڵێت:( گێڕدراوەتەوە لە فەرمودەی(ابی رافع) لە ئەبی هوڕەیرەوە لەو فەرمودە دەڵێت: پیاوێ هەبوو هیچ خێرێکی نەکردبوو تەنها تەوحید نەبێت، وە ئەم لەفزە پێچ و پەنای تێدا بەرز دەکاتەوەلە ئیمانی ئەم پیاوەدا، و ئەگەر درووست نەبێ لە گەیاندنیدا، ئەو ڕاستیەکەیتی لە ڕووی مەعنا و بنچینەدا گشتی بەهێز کردنیەتی لە تێڕوانین و پێویست بونی لەبەر ئەوە مەحاڵە و جائیز نیە کەسێ بمرێ و لەسەر کوفر بوبێ و لێی خۆشبێت!، لەبەر ئەوەی الله عز وجل هەواڵی پێداوین کەوا لە موشریک خۆش نابێت و مردبێ بەکافری، ئەمە هیچ پارێزگاریەکی نیە و هیچ جیاویەک نیە لەمەدا لە نێوان ئەهلی قیبلەدا)[التمهید/ج ٣٧/١٨]

عبیدالله ـی کوڕی محمد عبدالسلام مبارکفوري دەڵێت:(گێڕدراوەتەوە لەو فەرمودەبەم دەربڕینە: پیاوێک هیچ خێرێکی نەکردبوو تەنها تەوحید نەبێ، وە ئەم دەربڕینە کەم وکوڕیەک

لە ئیمانی دەردەخا، بەڵام بنچینەکەی بەهێزی دەکا(**إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ)[النساء/٤٨]**
گووتم: ترسان لە پێویستیەکانی ئیمانە وە کردەوەکەی ئەوە لەپێناو ترسی الله عز وجل بووە، فەرمودەکە ئاشکرایە و صریحە لە هەڵبژاردنی بە توحید، وەک ووتمان هیچ شتێکی تێدانیە)[مرعاة المفاتیح ٨/١٨٠]

شیخ عبداللطیف ـی کوڕی عبدالرحمن{رحمه الله} دەڵێت:(وە فەرمودەی ئەو پیاوەی فەرمانی کرد بە کەسوکارەکەی بە سوتاندنی، ئەو پیاوە موەحید بوو و لە ئەهلی شیرک نەبوو، هەر وەک و جێگیر بووە لە ڕێگای أبي کامل، لە حەمادەوە لە ابی رافع ئەویش لە ئەبوهوڕەیرەوە((هیچ کردەوەیەکی نەکردبوو تەنها تەوحید نەبێ)) بۆیە پوچڵە ئەو ناڕەزایانەی دەربارەی ئەو مەسائیلە دەکرێ و ناکۆکیان تێدا کردوە)[مناهج التأسيس والتقديس/ص٢١٨]

دووەم: ئەو پیاوە جاهیل و نەزان نەبوو بەڵکو کەسێ بوو لە ئەهلی ئیمان و ئەهلی علم، هەر،وەک و الله تعالی دەفەرموێ:

**(إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ)[فاطر/٢٨]** واتە : بەڕاستی ئەوانەی زانان لەالله دەترسێن.،

وەدەفەرموێت : **(فَاللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَوْهُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ)[التوبة/١٣]** واتە : هەر الله شایستەیە لێی بترسێن ئەگەر ئێوەئیماندارن.،

جا ئەو کەسە لە الله ترس بوو الله تعالی لێی خۆش بوو بەهۆیەوە، لەبەر ئەوەی لە ئەهلی علم و ئیماندا بوو، هەروەک و الله تعالی وەسفی ترسانەکانی کرد بە علم و ئیمان و پەیوەستی کرد پێیوە، جا ترسان نیشانەی هەبونی علم و ئیمانە،مەبەست کەسی کافر و موشریک نیە لەبەر ئەوەی ناچێتە نێو ترسان لە الله تعالی لەبەر ئەوەی نەزانە بە توحید، بە جیاواز لە گەڵ ئەو پیاوەی کەوا دانی نابوو بە تەوحیدی الله تعالی هەر وەک و ئیمامی احمد گێڕاویەتیەوە{هیچ خێرێکی نەکردبوو تەنها تەوحید نەبێ}

سێیەم: بەشێکی زۆری علمایان لە گەڵ ئەوەدان کە(قدر) بە مانای (ضیق) دێت یان(قضی) واتا ئەو دەربڕینەی کە دەڵێ{لئن قدر علی ربي} بە مانای{لئن قضی علی ربي}دێت، واتا

ئەگەر پەروەردگارم لەسەرم تەنگ بکات ئەوەبەشێوەیەک سزام دەدات کەوا کەسی ئاواسزا نەدابێ، بەڵگەش لەسەر ئەو مانایەی ووتەی الله عز وجل ـەدەفەرموێ:

١- **(وَذَا النُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَاضِبًا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقْدِرَ عَلَيْهِ فَنَادَىٰ فِي الظُّلُمَاتِ أَن لَّا إِلَٰهَ إِلَّا أَنتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ الظَّالِمِينَ)[الأنبياء/٨٧]** واته : ذا النون ـیش کە بە توڕەیەوە ڕۆشت و وای گومان برد، کە ئێمە تۆڵەی ئەوەی لێناکەینەوە، جا لە ناو تاریکایەکانی هاواری کرد و گووتی:بەڕاستی هیچ پەروەردگارێک نیەلە تۆزیاتر، پاکی بۆتۆ، بەڕاستی من لە ستەم کاران بووم.،

ابن عباس لە تەفسیری**{فَظَنَّ أَن لَّن نَّقْدِرَ عَلَيْهِ}** دەڵێت: واتا**{ظنّ أن لن نقضي عليه}**واته: وای گومان برد کەوا لەسەری تەنگ ناکەین.[الطبري]

قتاده و کلبی لە تەفسیری**{فَظَنَّ أَن لَّن نَّقْدِرَ عَلَيْهِ}** دەڵێن: واتا**{قالا ظنّ أن لن نقضي عليه العقوبة}** واته: وای گومان برد کە سزاکەی لەسەر تەنگ ناکەین.- طبري

ضحاک لە تەفسیری**{فَظَنَّ أَن لَّن نَّقْدِرَ عَلَيْهِ}** دەڵێت: واتا**{ظنّ أن الله لن يقضي عليه عقوبة}**واته: وای گومان برد الله سزاکەی لە سەر تەنگ ناکات.- طبري

٢-الله تعالى دەفەرموێت : **(وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ فَلْيُنفِقْ مِمَّا آتَاهُ اللَّهُ)[الطلاق/٧]**

واته:کەسێکیش کە هەژار بوو، ئەوا با بەو ئەندازەیە خەرج بکات کە الله داویەتیێ.

لێرەشدابەهەمان شێوە(قدر) بەمانای کەمی وتەنگی هاتووە**{وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ}**

٣-الله تعالى دەفەرموێت: **(اللَّهُ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاءُ وَيَقْدِرُ)([الرعد/٢٦]**

واته:الله ویستی لەسەر هەرکێ بێ رزق و ڕۆژی فراوانی پێ دەبەخشێ، وە تەنگ و کەمیشی دەکاتەوە.

طبری دەڵێت: واتای (قدر) لێرەدا بەمانای (قتر)ـە

(ثعلبی باسی لێوە کردوە، وە عطاء و سعیدی کوڕی جبیر و زۆرێک لە زانایان مانایەکەی: **{ظنّ أن لن نقضي عليه}** وایگومان برد لەسەری تەنگ ناکات، حسن دەڵێت: ئەوە ووتەی الله

ـیە دەفەرموێ : **(اللَّهُ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاءُ وَيَقْدِرُ)**واتا تەنگ کردن، وە دەفەرموێ:**(وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ)**ووتی: ئەمەش لە هەمان قسەی سعید و حسن دەچێ، لەبەر ئەوی(قدر-وقتر) واتا(ضیق) ئەوەش ووتەی ئیبن عباسە هە وەک و ماوردی و مهدوی باسیان لێوە کردوە، وە دەڵێت: وە لەقەدەر دا بریتیە لە (قضاء) و (حکم)، واتا وای گومان برد حوکمی لەسەر نادەین بە سزادانی، وە قتادە و مجاهد و فراء، قدریان کردوە بە حکم)[تفسیر القرطبي-٣٣١/١١]

جا بەووە زانیمان کەوا قدر بەمانای ضیق دێت لە زمانی عربی ـیدا هەر وەک و جمهوری زانایان و ئەهلی زمانەوانی و شوێنکەوتوانمان نەقڵ کرد.

جا بۆیە ئەوەمان بۆڕوون بویەوە کەوا ئەو پیاوە ئەوە نەبێ نەفی قدری رب العالمینی کردبێ قسە و مەبەستەکەی زۆر چاک بوە ترسان بوە لە الله تعالی بە لەسەر تەنگ کردنی و سزایەکەی

ابن حزم دەڵێت: ئەگەر تەسلیمی ئەو مانایە بین و بڵێین لەبەر ئەوە بوە، ئەی بۆچی فەرمانی کرد بە سوتاندی[الفصل لإمام ابن الحزم/ ج ٣/١٤١]

خاوەنی ئەو مەزهەبەی کە پێیان وایە بەمانای ضیق دێت، لە وەڵامی ئەو ووتەی ابن الحزم و کەسان تردا دەڵێن: لەبەر تورەیی و پەشیمانی ئەو کردەوە تاوانانەی کردیتی وای کردوە، وە بەشێکیش دەڵێن ئەوە جائیز بوە لە شەریعەتی ئەوان وە بۆ چاکی و تەواوی تەوبەکەیان بووە

هەر وەک و الله تعالی دەفەرموێت : **(وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ يَا قَوْمِ إِنَّكُمْ ظَلَمْتُمْ أَنفُسَكُم بِاتِّخَاذِكُمُ الْعِجْلَ فَتُوبُوا إِلَىٰ بَارِئِكُمْ فَاقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ عِندَ بَارِئِكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ إِنَّهُ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ)[البقرة-٥٤]**واتە :کاتێ کە موسا بەگەلەکەی خۆی ووت: ئەی گەلەکەم ئێوەستەمتان لە نەفسی خۆتان کرد بە گوێرەکە پەرستیتان، جا داوای تەوبە و لێخۆشبون لە پەروەردگارتان بکەن، لەلای پەروەردگارتانەوە وا جاکترە خۆتان بکوژن، بەڕاستی الله تعالی لەبوردەوە و بەبەزەییە.، نەسائی و ئیبن و جریر و ئیبن و حاتەم ڕیوایەتیان کردووە لە ئیبن و عەباسەوە دەفەرموێت:-(الله دەفەرمووێ تەوبەکەی ئەوانە ئەوەیە هەر کەسێ کەوتە دەستیان باوکیان بێ یان کوڕیان بێ دەبێ بیکوژێ و گوێ بەوەنەدا کە لەوێیە، ئەوەی کە لەلایەن

هاڕوون و موسادا دیار نەبوون، الله دەیناسین دانیان بەتاوانەکەیان دانا و ئەوەی فەرمانیان پێ کرا کردیان و الله تعالی خۆش بوو لە بکوژ و کوژراویش لەو تاوانەی کە کردبوویان)

[النسائي في الكبراء /٤٠٥/٤٠٤/٦، الطبري /٨/٣٠٦/ ،إبن أبي حاتم /١/١٦٨]

حافظی کوڕی ئەبی جمره دەڵێت:(ئەوپیاوە ئیماندار بوو لەبەر ئەوەی بە یەقین بە لێپێچینەوە وە سەرپێچیەکانی سزا وەردەگری، وە ئەوەی وەسیەتی کرد لەبەر ئەوەیە کەوا لە شەریعەتی وان جائیز بووە، ئەمەش لەبۆ چاکیانە لەبۆ تەوبەکەیان، هەر وەک و جێگیر بووە لە نەوەی ئیسرائیل بە کوشتنی نەفسی خۆیان لەبۆ درووستی تەوبەکەیان)[فتح الباري ١١/٣١٥]

وە قاضی عیاض دەربارەی ووتەکانی ئیبن جریر و ئەهلی علم لە وەڵامیان بۆ ئەوفەرمودەیە، دەڵێت:(ئەو کردەوەی کە کردی لەبەر ئەو توڕەیی بوو لە تاوانەکان و سەرپێچیەکانی)[الشفاء للقاضي عیاض ج٢/٢٣٩]

نووی دەڵێت:(ئەم کارەی بۆ سزادانی خۆی بوو لەتاوانەکانی، بەو هیوایەی الله تعالی ڕەحمی پێ بکات)[النووی ٩/١٢٤]

وە هەروەک و لە ڕیوایەتێ هاتووە(لم یبتئر) واتا هیچ کردەوەیەکی چاکەی جێگیر نەکردوە، لەبەر ئەوە پێی وابوئەوە تەوبەیەکە و گەڕانە و لێخۆشبونە بۆ لای الله لەبۆی، نەوەک پێی وابێ الله تعالی توانای لەسەری نیە لەسەر کۆکردنەوە و ڕێکخستنەوەی [عارض الجاهل ص٤٢١]

چوارەم: وە لە صحیحی موسلیمدا هاتوە لە فەرمودەی ئەبی سعید-بەهەمان شێوە- بە دەربڕینی:(وە بەڕاستی الله تعالی توانای هەیە لە سەرم سزام بدات)[٢٧٥٧-٧١٦٠]

پێنجەم: بەشێ لە ئەهلی علم دەڵێن ئەو پیاوە نەزان بوە بە صیفاتێک، جاهیل بونەکەشی بە بنچینەی صیفاتەکە نەبوە بەڵکو لە بەشێک لە صیفاتی {قادر}، ئەمەش دەیبەنەوە نێو مەسەلە خەفیەکان هەروەکو شەیخی ئیسلام ئیبن تیمە باسی لێوە دەکا، کەوا عوزر تێیدا قەبوڵەتەنها لەوەیاندا، بەڵام نەزانینەکەی ئەوە نیە باوەڕی بەصیفاتەکە نەبێ، نا بەڵکو زۆر چاک باوەڕی بە{قادر} الله تعالی هەبووە، بەڵام بە گومان بوە لەوەی چۆن خۆڵەمێشەکەی کۆدەکاتەوە و

زیندوی دەکاتەوە، یان هەمان شێوەی نمونەی بەسەرهاتی پێغەمبەر عوزەیر علیه السلام، کە الله تعالی دەربارەی دەفەرموێ : **(أَوْ كَالَّذِي مَرَّ عَلَىٰ قَرْيَةٍ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّىٰ يُحْيِي هَٰذِهِ اللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا فَأَمَاتَهُ اللَّهُ مِائَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُ قَالَ كَمْ لَبِثْتَ قَالَ لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ قَالَ بَل لَّبِثْتَ مِائَةَ عَامٍ فَانظُرْ إِلَىٰ طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمْ يَتَسَنَّهْ وَانظُرْ إِلَىٰ حِمَارِكَ وَلِنَجْعَلَكَ آيَةً لِّلنَّاسِ وَانظُرْ إِلَى الْعِظَامِ كَيْفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ قَالَ أَعْلَمُ أَنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)[البقرة/٢٥٩]** واتە : وەک و ئەو کەسەی کە بەلای گوندێکداتێپەڕی کە چۆڵ و هۆڵ بوو دیوارەکانیداڕوخابوون بەسەر سەربانەتەپیوەکانیدا، ئەو کەسە گووتی: الله چۆن ئەمە زیندوودەکاتەوە دوای مردنی؟، الله ـیش بۆماوەی سەد ساڵ مراندی، پاشان زیندوی کردەوە، الله تعالی لێی پرسی:چەند مایتەوە لە مردنەکەتدا؟ گووتی: ڕۆژێک یان هەندێک لە ڕۆژێک، الله تعالی فەرمووی:بەڵکو سەد ساڵ ماویتەتەوە لەمردنەکەتدا، جا تەماشای خواردن و واردنەوەکانت بکە تێک نەچوون، وە تەماشا گوێدرێژەکەشت بکە، بۆیە تۆشمان مراند بۆ ئەوەی بتکەینە بەڵگە و نیشانە بۆ خەڵکی، جا تەماشای ئێسکی گوێدرێژهکەشت بکە و بزانە چۆن ئێسکەکان بەرزدەکەینەوە و هەریەکەیان لەجێگەی خۆی دادەنێینەوە و گۆشتیان بەبەردا دەکەینەوە

جا ئەو پیاوەی ئەم فەرمودەیەش بەهەمانشێوە باوەڕی تەواوی بە گەڕانەوە و تانای الله تعالی هەبووبۆیە داوای کرد بیسوتێنن لە ترسی کردەوە کەمەکانی و تاوانەکانی، باوەڕی بە توانای الله تعالی هەبوو بەڵام ئەگەر بەم دەربڕینی ئەم گێڕانەوە وەربگرین بەهەمان شێوە مانای ئیمان نەبون بە توانای الله عز وجل نادات بەڵکو مانای ئیمان هەبون دەدات وە ووتەکەی بەهەمان شێوەی پێغەمبەر عوزەیر یان نمونەی پێغەمبەر ئیبڕاهیم.،

شەشەم: بەشێکی زۆری زانایان دەربارەی ئەو پیاوە لە حاڵەتێکی ناخۆش و خەم و ترس دابوو و ئاگاداری خۆی نەبوو لە کاتی سەرەمەرگ، نەیدەزانی چی ووتوە، کە لەو کاتەشدا هیچی لەسەر نیە، هەر وەک و نمونەی ئەو پیاوەی لە کاتی دڵ خۆشی داووتی(انت عبدی وان ربک)تۆ عەبدی منی و من پەروەردگاری تۆ- والعیاذ بالله جا ئەوەش هیچی لەسەر نەبوو لەبەر ئەوەی لە دڵ خۆشیان ئاگای لەخۆی نەما چی دەڵێ و عەقڵی لە سەر خۆی نەمابوو

قاضی عیاض{رحمه الله} دەڵێت:( ئەوەی ووتویەتی عەقڵی تەواو نەبووە و دەربڕینی ووتەکەی تەواو نەبوە، کەوا لە کاتێکی ترس و دڵەڕاوکێی دابووە، کەوا دڵی تێدا دەرچوە و هیچی لەسەر نیە)[الشفا بتعريف حقوق المصطفي ٢/٩٢٣]

ئیمامی نووی {رحمه الله} دەڵێت:(بەشێک دەڵێن: ووتەکەی لە سەر ڕوێکی ئاشکراوەیە، بەڵام دەڵێ ئەو پیاوە کەسێکی ناجێگیر و تەندرووست بوە لە دەربڕینی ووتەکەی، وە مەبەستی لەڕاستی ئەومانایە نەبووە، و بیروباوەڕیشی پێی نەبوە، بەڵکو لە حاڵەتێکی بەزین و دڵەڕاوکێ و ترسێکی توند و سەیردابووە، کەوە نەیزانیوە چی دەڵێ و لێی وردبێتەوە واتا گەشتۆتە بێئاگایی و بیرچونەوە، کە لەو حاڵەتەشدا هیچی لەسەر، هەر ووتەی ئەو کەسەی تر کەوا لە زۆری دڵ خۆشی دابوو ووتی:تۆ عەبدی منی و منیش پەروەردگارت، پێی کافر نەبوو لەبەر ئەوەی لە حاڵەتێکی سەیروسەمەردا بوو کە بەسەری دازاڵ بوو)[شرح نووي على مسلم ٩/١٢٤]

ئیبن تیمیە{رحمه الله} دەڵێت:(ئەو پیاوە ئیماندار بووە، وە ئیمانی هەبووە بە ڕۆژی دوایی ، کەوا الله تعالی لەپاش مردنی لێپێچینەوەی کرد کەوا کردەوە چاکەکانی بریتی بوولە ترسی لە الله تعالی لەوەی سزای بدات لەسەر کردەوەکانی، لێخۆشبونەکەی لەبەر ئیمنانەکەی بوو بۆ الله تعالی و ڕۆژی دووایی، وە هەڵە کردنەکەی لە توندی ترسی بوو هەر وەک و ئەو کۆچەرەی لەبێ ئومێدی دابوو، کاتێ دڵ خۆش بوو هەڵەی کرد)[مجموع رسائل والمسائل ٣/٣٤٦]

ئیبن بطاڵ لە[شرحی صحیح البخاري لابن بطال] وە ئیبن حجر لە[فتح الباري] وە ئیبن ومولقن لە[فتح الباري] بە هەمان شێوە باسیان لێوە کردوە

حەفتەم: وە بەشێک لە زانایان دەڵێن ئەو پیاوە لە سەردەمی فیترە دا بووە کەوا بەجێهێنانی تەوحید تیایدا بەس بووە

ئیمام قاضی عیاض دەفەرموێ: - (گووترایە ئەو کەسە لە سەردەمی فیترە دا بووە کە ئەنجام دانی تەوحید لەم سەردەمەدا بەس بووە) [الشفا بتعريف حقوق المصطفي_٢٩٣/٢]

ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ :-

(بەشێک لە زانایان دەڵێن ئەو پیاوە لە سەردەمی فیترە دا بووە بە جێهێنانی تەوحیدیش تێیدا بەس بووە بۆ نەجات بوون)

[شرح نووي على المسلم_١٢٤/٩]

ئیبن حەجەر دەفەرموێت :-

(پیاوەکە دانی بەوە دا دەنا کە الله درووستکەری گەردوونە وە لە سەردەمی فیترەدا دەژیا مەرجەکانی ئیمانی پێ نەگەیشتبوو) [فتح الباري بشرح سحيح البخاري_٥٢٣/٦]

جا هەروەک و بینتیان ئەهلی علم چۆن لەم فەرمودەیە تێگەیشتون بە چ شێوەیکی تر ڕیوایەت کراوە و وەبەهەمان شێوە لە سەر ئەم ڕیوایەتەی سەرەتاش کەوا گەر بەڕوێکی ئاشکراوە وەری بگرین هەروەکو ڕون کردنەوەی زانایانماندانا لە ڕاڤەی ئەم فەرمودەیە بەهەمان شێوە هیچ جیاوازیەک درووست ناکات لە گەڵ ئەوەی تردا، وە ئەم پیاوەش ئەهلی تەوحید بووە نە کارەکەی نە ووتەکەی کوفری نەبووە، بە هیچ شێوەیەک و لێکدانەوەیەک نابێتە بەڵگە بۆ بابەتی عوزر هێنانەوە بۆ نەزان.

## گومانی چوارەم: فەرمودەی {ذات أنواط}

(لە ئەبو واقیدی لیثی{رضي الله عنه}دەیگێڕێتەوە: لەگەڵ پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم بەرەو حونەین دەرچوین، و ئێمە تازە موسڵمان بوبوین، لەڕۆژی فتحی مەکەدا، بەلای دارێکدا ڕۆشتین ووتمان:ئەی رسول الله دارێکمان بۆ دابنێ هەروەک و ئەوانە دارێکیان هەیە، کافران دارێکیان هەبوو ئعتیکافیانی دەکرد بەدەوریدا و چەکەکانیان پێوە هەڵدەواسی، پێیان دەوت:ذات انواط، جا کەئەمەمان بە رسول الله ووت، فەرموی:الله اكبر سوێند بەوەی نەفسی منی بەدەستە ئەوەتان ووت هەروەکو نەوەی ئیسرائیل بە موسایان ووت: پەرستراوێکمان بۆ دابنێ هەروەک و ئەوەی ئەوان پەرستراوێکیان هەیە، موساش فەرموی: بەڕاستی ئێوە گەلێکی نەزانن،پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموی: شوێن ڕێبازی گەلانی پێش خۆتان دەکەون!؟)

ئەهلی ئەهواء لەم فەرمودەیەدا دڵێن: ئەوانە نەزان بوون رسول الله عوزری بۆ هێنانەوە بە کافری دا نەنان..!!

لەوەڵامی ئەم گومانەیان دا دەڵێین:

ئەوەی ئەوصحابیانە بە رسول الله صلی الله علیەوسلم ـیان ووت داوای ئیزن لێ وەرگرتنیان نەکرد و کارەکەیان نەکرد بەڵکو تەنها داوایان لێی کرد، نەوەک ئەم کارە شیرک و کوفریەکانیان بکەن،خۆ ئەگەر لەپاش ئەو ڕێگری لێکردنەیان ئەوە پێی کافر دەبون گومانی تێدا نیە

شیخ محمدـی کوڕی عبدالوهاب لە وەڵامی ئەم گومانەدا دەڵێت:( موشریکان گومانێکیان هەیە دەیکەنە بەڵگە بەم بەسەرهاتە، کەوا دەڵێن: نەوەی ئیسرائیل کافر نەبوون، وە ئەوانەی داوایان لە رسول الله کرد ذات انواط ـیان بۆ دابنێ کافر نەبون، لەوەڵامدا دا دەڵێین: نەوەی ئیسرائیل ئەم کارەیان نەکرد، وە ئەوانەی داوایان لە رسول الله صلی الله علیە وسلم کرد ئەم کارەیان نەکرد، وە هیچ خیلافێک لەوەدا نیە ئەگەر نەوەی ئیسرائیل ئەم کارەیان بکردایە ئەوە پێی کافر دەبون، وە هیچ خیلافێکیش لەوە دانیە ئەگەر ئەوانەی رسول الله ڕێگری لێکردن گوێڕایەڵیان نەکردبایە پێی کافر دەبون، وە لەم بەسەرهاتە ئەو سودەمان بۆ دەردەکەوێ کەوا موسڵمان گەر زاناش بێ دەکەوێتە نێو جۆراوجۆری کوفر و شیرک و بەخۆشی نازانێت سودی بۆمان ئەوەیە خۆمان فێربکەین و خۆمان بپارێزین، وە بزانن ئەم ووتەیەی نەزان(لە تەوحید تێگەیشتوین)ئەمە لە گەورەی نەزانینیانە و لە فێڵی شەیطانە بۆیان)[کشف الشبهات/ص٥٦]

ئیمامی شوکانی دەڵێت:( مەبەستی هاوڵان ئەوە نەبوو کە دارەکە بپەرستن یان داوای ئەم شتانەیان لێ بکەن کە گۆڕپەرستان داوا لە خاون گۆڕەکان دەکەن، جا ئەوە بوو رسول الله پێی ڕاگەیاندن کە ئەم کارەیان شیرکێکی ڕوونە، وەک و ئەوە وایە داوای پەرستراوێک بکەی جگە لە الله تعالی)[الدرر النضید في إخلاص کلمة التوحید ص٣٦]

صەحابیەکان کارەکەیان ئەنجام نەدا گەر ئەنجامیان دابا هەمان حوکمی خاوەن دارەکەیان دەبوو، هیچ گومانێک لەوە دانییەم

وە پاشان کە داوایان کرد دارێکیان هاوشێوەی ئەم دارەیان بۆ دابنێ مانای وانیە وەک و ئەو موشرکانە کە پەرستن و داوا و.. بۆ ئەم دارە دەکەن، نا بەڵکو بۆ ئەوەیان بوو هاوشێوەیان تەنها لەوەدا چەکەکانیان پێیەوە هەڵبواسن بۆ بەرەکەت و سەرکەوتن لەلایەن الله تعالی، نەوەک کە ووتیان دارێکمان بۆ دابنێ هاوشێوەی ئەوان بەمەبەستی کردنی گشت ئەو کارەی ئەوان دەیکەن، نەخێر نمونە هەروەک و رسول الله دەفەرموێت(ئاڵودەبونی مەشڕوب وەک و بت پەرستیە) ئایا بت پەرستی بوو پێی کافر بوون نا بەڵکو کارەکەیان لە ئاڵودە بون هاوشێوەی یەکتر بوون هەروەک و کەسێکی بت دەپەرستێ پێیەوە ئاڵودە بوە و ناتوانێ وازی لێ بێنێ ئاڵودە بونی مەشڕوبیش بەهەمان شێوە، وە رسول الله نەیووت(ئاڵودەبونی مەشڕوب شیرکە) نا، یان کە رسول الله دەفەرموێ:(هەرکەسێ نوێژی عیشا بکات بەجەماعەت وەک و ئەوە وایە لە نیوەی شەودا هەڵسابێتەوە بۆ نوێژ،وە هەرکەسێ نوێژی بەیانیش بکات بەجەماعەت وەک و ئەوە وایە گشتی شەوەکە هەستابێتەوە بۆ نوێژ) هەر وەک و زانراوە ئەوە چاکەی ئەو کارەی ناگات بەو کارەی کە پێیەوە هاوشێوە کراوە نا بەڵام هاوشێوەی ڕێز و گەورەی ئەو نوێژە جەماعەتەیە،نمونە وەکو بڵێین معاذ شێرە، ئایا مەعاذ شێر بوو؟ نەخێر بەڵام لە ئازایەتیەکەی هاوشێوە کرا

ابن القیم{رحمه الله} دەڵێت:(مەرج نیە شتێ بە شتێک چوو گشت حوکمەکانی بگرێتەوە)[الداء والدواء ص١٨١]

جا صحابیە بەڕێزەکان مەبەست و ویستیان لەوە نەبوو کەوا داوای کوفر و شیرکیاتی ئەوان بکەن بە هاوشێوە و گشت حوکمەکانیان، بەڵکو تەنها دارێکیان داوا کرد چەکەکانیان پێیوە هەڵبواسن بۆ بەرەکەت و سەرکەوتنیان پەروەردگار پێیان ببەخشی، ئەگەر بڵێین ئەوان نەخێر مەبەستیان شیرکی ئەوان بووە، دەڵێین: ئەوانە عرب بوون و لە مانای لااله‌الاالله تێگەیشتبوون کە وازیان لە بت پەرستیەکانیان هینا بوو دەیانزانی کوفرە و کوفریان پێی کردبوو، جا چۆن دوبارە دەگەڕێنەوە سەر هەمان ڕێچکەی پەرستن و داواکردن لە بت و دار؟ خۆ ئەوان لە مانای لااله‌الاالله زۆر باش تێدەگەیشتن! وە رسول الله صلی الله علیه وسلم ـیان باش دەناسی لەسەرەتاوە کەوا دژی شیرک و کوفر و پەرستنیەتی، بەڵام تازە موسڵمان بوبون کەوا

لە ئەحکامەکانی بەڕائەت کردنی موشریکان چاک تێنەگەیشتون وایان زانیوە لای رسول الله ئەمە جائیزە گەر دارێک دابنێن بۆ چەک پێوە هەڵواسین بۆ تەبەڕوک، وە ئەو صحابیانە نە بڕوایان وابوو نە کارەکەشیان کرد بەڵکو تەنها داوایان لە رسول الله کرد، رسول الله صلی الله علیە وسلم ڕێگری لێ کردن بە کردنی ئەم کارە و ئەوانیش خۆیان لێی بەری کرد، ئەمەش هیچ شیرکێکی تێدا نیە، خۆ ئەگەر کارەکەیان بکردایە ئەوە بێ گومان پێی کافر دەبون. خۆ مەبەست و داواکاری ئەوان ئەوە نەبێ ئەوان داوای ئەو پەرستن و کوفر و شیرکە بکەن، نەخێر هەرگیز بەڵکو ئەو داوا کردنەی ئەوان بۆ پێوە هەڵواسینی چەکەکانیان بوو وایانزانی بەرەکەت وسەرکەوتنە، نمونە وەک و بەردە ڕەشەکەی کەعبە کەوا لە بەهەشت دابەزیوە و پیرۆزە و دەست پێ داهێنانی وماچ کردنی، خۆ ئەم بەردە ڕەشە قوڕەیشی موشریکی بت پەرست بەر لە هاتنی رسول الله ـوە صلی الله علیە وسلم بە شتێکی گرینگ و پیرۆزیان دەزانی و ڕایان دەگرت، یان ئاوی زەم زەم، هەمان شێوە هەڵبژاردنی دارەکەبۆ هەڵواسینی چەکەکانیان بوو وایان زانی شتێکی بەرەکەت دار و چاکە کە زۆرڕونە وەک وئەونمونانەی باسمان کرد، جا رسول الله ڕێگری لێ کردن لەپاش ئەو داواکایان، وە دوبارە ئەو هاوشێوە کردن و چواندنەی رسول الله صلی الله علیە وسلم بە نەوەی ئیسرائیل هەر وەک و لەسەرەوە باسمان کرد، مەرج نیە هەموو لێک چواندنێک گشت حوکمەکانی شتەکە بگرێتەوە.

جا ئەگەر لە پاش ئەو ڕێگری لێ کردنەیان ئەم کارەیان بکردایە حەتمەن پێی کافر دەبون، بەڵام ئەو کەتەی داوایان کرد و ڕێگریان لێ کرا نە شیرکی بچوک بوو نە گەورە وە پێشی لەدین دەرناچوون زۆر ڕونە، گەر پاش ئەوەئەم کارەیان بکردایە ئەوە تشبیهـ و کوفر بوو و حوکمیان هاوشێوەی حوکمیان دەبوو، **(وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ)[المائدة/٥١]** وەهەروەها (من تشبه بقوم فهو منهم)

وەپاشان ئەم فەرمودەیە ضحیفە ضحیفە، لە ڕوی سەنەد و مەتنەوە یەکجار کێشەی تێدایە، بە هیچ جۆرێک ناکرێتە بەڵگە بۆ بابەتی هێنانەوەی عوزر بۆ نەزان،بۆ ئەوانەی ئینکاری صحیحی فەرمودەکەش دەکەن لێرە بابەت درێژ ناکەینەوە دەتوانن بگەڕێنەوە کتێبی ئەو برایە(دیڕاسەی فەرمودەی ذات انواط لەڕوی سەنەد و مەتن و ماناوا)،جا خۆ

ئەگەرصحیحیش بێت خۆ هەر ناكرێتە بەڵگە هەر وەک و لەسەرەوە ڕونمان كردەوە بە هیچ شێویەک شیركیان نەكردووە تا وەک و عوزریان بۆ بهێندرێتەوە.

## گومانی پێنجەم: بەسەرهاتی قودامە

گومانی قودامە(رضي الله عنه)، كەوا بەشێكی زۆر لەو گومڕایانەی بانگەوازی ئەوە دەكەن كەوا عوزر بۆ جاهیل هەیە لە كردنی كوفر و شیركدا، ئەم بەسەرهاتەی قودامە دەكەنە بەڵگە و دەڵێن:سەیركەن ئەم صحابە خواردنی مەشڕوبی حەڵاڵ كرد بەڵام ئیمامی عومەر و صەحابیەكانی تر تەكفیریان نەكرد بەڵكو بۆیان ڕوون كردەوە.

دەڵیین:لەڕاستی دا ئەم بەسەرهاتە ئاوا نیە كەوا ئەم بانگەوازكارانەی بەرەوگومڕایی دەیكەن و باسی لێوە دەكەن، بەڵكو دەیانهەوێ حەقیقەتەكەی لە فێرخوازان بشارنەوە و بەویست وعەقڵی خۆیان دەقەكان بگۆڕن و بەشێویەكی تر باسی لێوە بكەن

عبدالرزاق ووتی لە معمرەوە،ئەویش لە زوهریەوە ووتویەتی: عبداللە ـی كوڕی عامر هەواڵی پێ دام، كە باوكی شەهیدی بەدرە،كەوا عمری كوڕی خطاب، كەوا كاری بە قودامە دەكرد لە بەحرەین، كەوا خاڵی حفصە و عبداللە ـی كوڕی عمرە، جارود سەیدی قەیس لە بەحرەین بە عمری ووت: قودامە خواردویەتیەوە و سەرخۆش بوە،لەڕاستی  دا من وای دەبینم حەدەک لە حەدەكانی اللە ـی بەسەردا بەرز كەیەوە، عمر ووتی: كێ لە گەڵت شاهێدی ئەوە دەدا؟ ووتی: ئەبوو هوڕەیرە، بانگی ئەبو هوڕەیرەی كرد و پێی ووت بەچی شاهێدی دەدەی؟ ووتی: نەم بینیوە بیخواتەوە بەڵام بینیم سەرخۆش بوو، عمر پێی ووت: لە شاهێدیەكەت شكستت هێنا، ووتی: پاشان نوسراوێک پێشكەش قودامە بكە لە بەحرەین، جارود بە عمری ووت: هەستە بە كردنی ئەم كارە لە كتێبەكەی اللە ـوە، عمر پێی ووت: تۆ شاهێدی دەری یان كەمكەرەوەی؟ ووتی شاهێدم، عمر پێی ووت: ئێ شاهێدیەكەت ئەنجام بدە، جارود بێ دەنگ بوو تا بەیانی بە عمری ووت: هەستە بە جێبەجێ كردنی ئەم حەدە، عمر پێی ووت: هیچ لێ نابینم جگە لە لێكەم كردنەوەی وە هیچ شاهێدێكت لەگەڵ نابینم تەنها پیاوێنەبێ، جارود ووتی:من لێی دەگەڕێم بۆت بۆاللە، عمر ووتی:زمانت دەیگرێ یان خراپی، جاروود ووتی:

والله ڕاستی ئەوەیە ئامۆزاكەت دەخواتەوە، ئەبو هوڕەیرە ووتی: ئەگەر گومانت لە شاهێدیەكەی ئێمە هەیە ئەوە بانگی كچی وەلید بكە و پرسیاری لێ بكە، ئەو خێزانی قودامەیە، عومەر ناردی بەدوای هندی كچی وەلید شاهێدی پێدا، ئەویش شاهێدی دا لەشەر مێردەكەی، عمر بە قودامەی ووت: من حەدت لەسەر دەكەم، قودامە ووتی: خواردمەوە هەر وەک و ئێوە ووتان ناتوانن جەڵدم لێدەن، عمر ووتی: لەبەر چی؟، قودامە ووتی: الله تعالی دەفەرموێت: ( **لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوا إِذَا مَا اتَّقَوا وَّآمَنُوا)[المائدة/٩٣]**واتە: لەسە ئەو ئیماندارانەی كردەوەی چاكە دەكەن لەسەریان نیەگەر بخۆنەوە ئەگەر لە الله ترس بن.، عمر پێی ووت: لێكدانەوەكەت هەڵەیە، بەڕاستی ئەگەرلە الله ترس بی و تقوای الله ـت هەبێ ئەوە دوور دەكەویەوە لەوەی الله عز وجل لەسەری حەڕام كردوی، پاشان عمر لە گەڵ خەڵكی ووتووێژی كرد ووتی: چی دەبینن لە جەڵد لێدانی قودامە؟ ووتیان: هیچی لێ نابینین نەخۆش بێت، بێ دەنگ بوو لەسەر ئەوە ئەو ڕۆژی، بەیانی هەستا بە جەڵد لێدانی و بە هاوەڵەكانی ووت: چی دەبینن لە جەڵد لێدانی قودامە؟ ووتیان: هیچ نابینین لێی لەوەی ئازاری هەبێت، عمر ووتی: لەبەر ئەوەی بگەیتەوە بە الله لە ژێر قامچی لێدان پێمم خۆشترە لەوەی پێی بگەیت بە لەملدان و لێدانێكی تەواو، فەرمانی كرد بە جەڵد لێدانی قودامە و توڕەبوو لێی و هەجری كرد و قودامەش لەگەڵی توڕەبوو، پاش ئەوە عومەر لەئاودان دابەزی و خەوی لێ كەت كاتێ هەستا لەخەو ووتی: خێرابكەن قودامەم بۆ بێنن سوێن بە الله بینیم چۆن هات هاتنێ بۆمن، ووتی: قودامە سەلامەتە بەڕاستی ئەوە براتە و خێرابكە لێی وەمن حەزدەكەم بێم، عمر فەرمانی كرد بیهێنن گەر نەیویست بێت ئەوە ڕایبكێشن بۆی، عمر قسەی لەگەڵ كرد و داوای لێخۆشبونی لێكرد ئەمە یەكەم ئاشتەوایانبوو.

[بەسەنەدێكی صحیحەوە لە بخاري/ ١٤٧٣/ج٤]وە لە[ قرطبی/ج٦ ص٢٩٨]

شیخ الإسلام ئیبن تیمیە لەوەڵامی ئەم گومانەدا

دەڵێت:(ئەم گومانە كەوتۆتە نێو بەشێک لە سەرەتایەكان، بەڕاستی صەحابەكان متفق بوون لەسەر كوشتاریان گەر تەوبەی لێ نەكەن، كە قودامە خواردبویە و لێكدانەوەی بۆ ئەم ئایەتەی الله تعالی: (**لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوا إِذَا مَا اتَّقَوا**

**وَّآمَنُوا)** هەروەک و باسکراوە لە عمری کوڕی خطابەوە بە ئیتفاق، وە علی کوڕی کوی ئەبی طالب و صحابەکانی دیکە لەسەر ئەوەی دانیان بە حەرامێتیەکەی دانا و جەڵدکران، وە ئەگەر پێداگیریان بکردایە لەحەڵاڵێتی ئەوە دەکوژران، هەروەک و عمر بە قودامەی ووت:هەڵەت کرد چاڵەکە پڕکەرەوە، ئەگەر تۆ تەقوای الله ـت هەبێ و ئیمانت پێی هەبێ و کردەوەی چاکە بکەین مەشڕوب ناخۆیتەوە، وەلەبەر ئەوە ئەم ئایەتە دابەزی هۆکاری: الله سبحان وتعالی کاتێ مەشڕوبی حەڕام کرد- لەپاش کەوتنەناوی کەسێکەوە حەڕامی کرد، بەشێ لە صحابیەکان دەڵێن: ئەی چی دەربارەی ئەو هاوەڵانەمان مەشڕوبیان خواردبویەوە و مردون؟ الله تعالی ئەم ئایەتەی دابەزاند و ڕوونی کردەوە کەوا هەر شتێ خورابێت لە کاتێکدا کەوا حەڕام نەکراوە ئەوە هیچ تاوانیان لەسەر نییە ئەگەر لەئیمانداران و موتەقی و چاکەکاران بن)[مجموع الفتاوای ابن تیمیة/تصوف-١٨٨]

ئیمام قاضي ئیسماعیل ـی کوڕی ئیسحاق دەڵێت: (ئەوە لەو کەسانە بوو کەوا موتەقی و ئیماندار و چاکەکار بوو، بەڵام هەڵەی کردبوو لە لێکدانەوەیەکی جیاواز لە بەحەڵاڵ زانینی)[الفروق-٣٠٣/١]

قودامە{رضي الله عنه} مەشڕوبی بەحەڵاڵ نەزانی بەڵکو دڵنیا بوو لە حەڕامێتی مەشڕوب، بەڵام لێکدانەوەکەی قودامە لە جێبەجێ کردنی حەدەکە بوو لەسەری پێی وابوو ئەوەی پێشووتر کار و کردەوەی چاکەی کردبێ کە ئەم حەڕامێتیە ئەنجام بدات پێی تاوانبار نابێت و حەدی لەسەر جێبەجێ ناکرێت لەبەر ئەوەی پێشوتر کار و کردەوەی چاکەی کردبوو پێ وابوو ئەم کارانەی کردویەتی تاوانی خواردنەوەی دەسڕێتەوە، هەروەک و فەرمووی(ناتوانی جەڵدم لێ بدەی!) نەیووت خۆ حەڕام نیە حەدی چی؟ بەحەڵاڵی بزانێت نەخێر کێشەکەی قودامە لە حەڵاڵ دانانی مەشڕوب نەبوو بەڵکو دڵنیا بوو لە حەڕامێتیەکەی، کێشەی لە هەڵە تێگەیشتن بوو لە جێبەجێ کردنی حەد لەسەری، وە هەروەک و لە ڕیوایەتی نەسائی دا دەڵێت:( من لە موهاجیرانی سەرەتایەکان بووم وە لە ئەهلی بەدربووم وە لە ئەهلی ئوحود) پێی وابوو ئەم کارانەی تاوان و حەدەکەی لەسەر دەسڕێتەوە بە تێگەیشتنی لەم ئایەتەدا: **(لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوا إِذَا مَا اتَّقَوا وَّآمَنُوا)[المائدة/٩٣]**

ئەم لێکدانەوەی پوچەڵ کردنەوەی بنچینەی جێبەجێ کردنی حەدەکەنەبووبەڵکو بەشێکی شاراوەیی ئەم بابەتە بوو، وە قودامە لە هاوڵانی بەدر بوو کەوا رسول الله دەربارەیان دەفەرموێت لە فەرمودەی حاطب کە دەچینە سەری ان شاءالله تعالی دەڵێت: (الله تعالی ڕووی قسەی کردۆتە هاوەڵانی بەدر و پێی فەرموون بە ئارەزوی خۆتان چی دەکەن بیکەن من لێتان خۆشبووم). بۆیە قودامە وا خۆی حیساب کردبوو لە هاوڵانی بەدربوو{رضي الله عنه}

وە ئەگەر وەک و ئەو تێگەیشتنە بێ لێکۆڵینەوە لێی بڵێین مەشڕوبی بە حەڵاڵ زانیوە.! ئایا قودامە عوزری بۆ هێندرایەوە یان نا؟ نەخێر قودامە عوزری پێ نەدرا هەروەک و ووتەی شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە لەسەرەوە دامان نا لە پاش نەقڵ کردنی ئیجماع لەسەر کوفری هەرکەسێ مەشڕوب یان بابەتێکی تری مەسائیلە ظاهیریەکا بەحەڵاڵ بزانێ و عوزری بۆ نیە، پاشان ئەم بابەتەی قودامە نەقڵ دەکا و ئیجماع نەقڵ دەکات لە سەر جێبەجێ کردن حوکمی مورتەد بەسەر قودامە ئەگەر هاتبا و پێداگیری بکردایە، گەر جوان لەو بەسەرهاتەی قودامە وورد ببینەوە تا ئەو کاتەی ئیمامی عمر قسەی لە گەڵ قودامە کرد هەر ناکۆکیان هەبوو لەسەر ئەوەی ئایا قودامە سەرپێچی کردوە و و خواردویەتیەوە یان نا، نەوەک ناکۆکیان هەبێ لەسەر ئەوەی ئایا قودامە بەحەڵاڵی زانیوە یان نا، خۆ ئەگەر سەرەتا بیانزانیبایە قودامە بەحەڵاڵی زانیوە ناوی کوفریان بەسەردا جێگیر دەکرد وە لەپاش تەوبە پێ کردنی حوکمی کوفر و ڕیددەیان بەسەردا جێگیر دەکرد گەرهاتبا و پێداگیری بکردبا، وە گەر وورد ببینەوە و بەدوا داچون بۆ ئەم بەسەرهاتەی قودامە بکەین ئیمامی عمر پێی فەرموو جەڵدت لێ دەدەم واتا تەنها وای لێ تێگەیشتوە سەرپێچی کردوە نەوەک بە ڕەوای بزانێ بۆ خۆی وە پاشان کە ووتی ناتوانی جەڵدم لێ بدەی لەبەر ئەم هۆیانە، ئیمامی عمر پێی فەرمووی هەڵەی ئەگەر تەقوای الله ـت هەبێ وات نەئەکرد قودامە هیچ ووتەیەکی نەبوو لەپاش ئەمە وە ملکەچ بوو وە ئیجماعی صحابەش لەسەر ئەوەن کەوا قودامە بەحەڕامی زانی و جەڵدی لێدرا خۆ ئەگەر هاتبا و بیوتایە حەڵاڵە و پێداگری کردبا ئەوکاتە حوکمی کوفریشیان بەسەردا جێگیر دەکر وەک و شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە و محمدی کوڕی عبدالوهاب ئیجماع لەبارەیەوە نەقڵ دەکەن، جا بەهیچ شێویەک قودامە مەشڕوبی بەحەڵاڵ نەزانیوە بەڵکو دڵنیا لێی وە ئەگەر بڵێین بە حەڵاڵیشی زانیوە بۆخۆی ئەوە ڕونمان کردەوە بە ووتەکانی شێخی ئیسلام کەوا هیچ

پێداگیریەکی نەبوو بەڵکو لەهەموو گێڕانەوەکاندا هەرکە ئەم قسەیەی کرد: ناتوانی جەڵدم لێدەی..، هیچی نەوتەوە لەبەر ئەوەی ملکەچ بوو وە ئەگەر بڵێن پێشتر عوزری پێ درایە ئەوە بوختانێکی ئاشکرا بە صحابە و ئیمامی عمر دەکرێ لەبەر ئەوەی ئیمامی عمر بە هیچ شێوەیەک ئاگاداری حاڵی قودامە نەبوو، بەڵکو ناکۆکی لەسەر حاڵی ئەوە بوو ئایا تاوانی ئەنجام داوە یان نا، نەوەک بەحەڵاڵی زانیوە یان نا تا وەک و تکفیر بکرێ و عوزری بۆ بهێندرێتەوە یان نا، بۆیە ئەوانەی ئەم بابەتە باس دەکەن و گومان درووست دەکەن بۆ بابەتی عوزر بۆ نەزانی ئەوە لە نەزانینیانە بەم بابەتە و تێنەگەیشتنیانە بە بەسەرهاتەکەی و ووتەی زانایان دەربارەی.

## گومانی شەشەم: بەسەرهاتی حەواریەکان

الله تعالى دەفەرموێت: (**إِذْ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ أَن يُنَزِّلَ عَلَيْنَا مَائِدَةً مِّنَ السَّمَاءِ قَالَ اتَّقُوا اللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ-قَالُوا نُرِيدُ أَن نَّأْكُلَ مِنْهَا وَتَطْمَئِنَّ قُلُوبُنَا وَنَعْلَمَ أَن قَدْ صَدَقْتَنَا وَنَكُونَ عَلَيْهَا مِنَ الشَّاهِدِينَ**)[المائدة/١١٢]

واتە: کـە حەواریــەکان گووتیان: ئەی عیسای کوڕی مەریەم، پەروەردگارەکەی تۆ دەتوانێت خوانێکمان لەئاسمانەوە بۆ بێنێتە خوارەوە؟ عیسا فەرمووی: لە الله بترسێن گەر ئێوە ئیماندارن-گووتیان دەمانهەوێت لەو نان وخوانە بخۆین و دڵەکانمان دڵنیــا ببن و تێبگەن کەوا بەدڵــنیایەوە تۆ ڕاست بووت لە گەڵمان، لەسەر ڕاستی هاتنە خوارەوەی ئەم خوانەش لەشاهێدیەکان بین.،

لەم گومانەشیاندا ئەم ئایەتە پیرۆزە بەعەقڵی خۆیان لێکی دەدەنەوە و دێن دەڵێن ئەمانە گومانیان لەتوانای الله هەبووە و عوزریان پێ درا و تەکفیر نەکران..!!سبحان الله

سەرەتا ئەم کارە و ئەم داواکاریەی ئەوانە نە گومان بون لە توانای رب العالمين نە کوفر بوو نەشیرکیش بوو تا وەک و بڵێن جاهیل بونە و عوزریان بۆهێندراوەتەوە، ئەم داوا کاریەی ئەمان وەک هەمان ئەو داواکاریەی پێغەمبەر ئیبراهیم بوو علیه السلام کەوا الله تعالى

دەربارەی دەفەرموێ : **(وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِي الْمَوْتَىٰ)**واتە: کە ئیبڕاهیم گووتی: ئەی پەروەردگارم نیشانم بدە چۆن مردوەکان زیندوو دەکەیەوە؟.،**(قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن)**الله تعالی پێی گووت: بۆ باوەڕناکەی؟.،**(قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي)**ئیبراهیم گووتی: بەڵێ باوەڕدەکەم بەڵام بۆ ئەوەیبەتەواوی دڵنیا بم.،[البقرة/٢٦٠] جا خاوەن عەقڵە ژیرەکان سەیرێکی ئەم بەسەرهاتەی ئیبراهیم علیه السلام بکەن و سەیرێکی ئەم بەسەرهاتەی حەواریەکان بکەن بزانن چیتان بۆ دەردەکەوێ؟! حەواریەکانیش چیان گووت؟ گووتیان:ئەی عیسا پەروەردگارەکەی تۆ دەتوانێ خوانێکمان بۆ بێنێتە خوارەوە، خۆ بەو مانای توانایە نیە دەچینە سەر ئەویش بەڵام گەر وەک و خۆتان گەرئاوهاش وەری گرین، جا پێغەمبەر ئیبڕاهیم کە ئەو داوایەی کرد، الله تعالی پێی فەرموو: باوەڕت پێی نیە؟ جا ئەم حەواریانەش بەهەمان شێوە پێغەمبەر عیسا پێی فەرموون:ترسی الله ـتان هەبێ ئەگەر ئیماندار بن، واتا وەڵامی پێغەمبەر عیسا علیه السلام هەمان وەڵامی الله تعالی ـبوو کە بە ئیبڕاهیمی دایەوە علیه السلام، پاشان وەڵامی ئیبڕاهیم و حەواریەکان، ئیبڕاهم چی گووت؟ گووتی:بەڵێ باوەڕدەکەم بەڵام بۆ ئەوەیبەتەواوی دڵنیا بم، باشە ئەی حەواریەکان؟ گووتیان: دەمانهەوێت لەو نان وخوانە بخۆین و دڵەکانمان دڵنیـــا بین و تێبگەن کەوا بەدڵــنیایەوە تۆ ڕاست بوویت لە گەڵمان، لەسەر ڕاستی هاتنە خوارەوەی ئەم خوانەش لەشاهێدیەکان بین.، هەردوو لا بۆ دڵنیـــا بونەوەیان بوو، گەر جوڕئەت دەکەن دەی بڵێن پێغەمبەر ئیبڕاهیم ـیش نەزان بوو گومانی لە توانای الله تعالی هەبوە و عوزری پێ درایە؟ چ کەسێکتان ئەو جورئەتەتان هەیە.، پەنادەگرین بە رب العالمین لەم بیرکردنەوە باطڵانە، پاشان پرسیارێکی تریش درووست دەبێ لێرەدا لە کەموکورتی ئەم گومانانەیان، باشە گەر ئەم کارەی ئەوان گومان هەبوون بوو لە توانای زاتی پاکی رب العالمین باشە بۆچی پێغەمبەر عیسا علیه السلام داواکەی قەبوڵ کردن و داوای لە الله تعالی کرد بەو داوایەی ئەوان؟ گەر بەو بیرکردنەوەی گومانەکانتان بێت، یان پێغەمبەر عیسا ـیش گومانی هەبوە لە گەڵ ئەوان بۆیە داوای کردوە.!! یان ئەوەتا ئەو گومانی نەبوە و زانیویەتی بەڵام پێداگیر بوە و هاوبەش بوە لەو تاوانە و کارەی ئەوان.!! پەنادەگرین بە الله تعالی لەم جۆرە بیرکردنەوە باطڵانەیان، پێغەمبەر عیسا قەناعەتی بەوە بوو کەوا ئەوان گومانیان نیە تەنها بۆ دڵنیا بونەوە ئەم دڵنیا بونەوەش مانای گومان نیە دڵنیان بەڵام دڵنیاتر

بونەوە، جا پێغەمبەر عیسا دانی بەواندانا کەوا ئەوان گومانیان نیە بۆیەش پاش تەئکیدپێکردنەوەیان کە ووتی ترسی الله ـتان هەبێت، ئەوانیش پێیان ووت جا پێغەمبەر عیسا داوای بۆ کردن : **(قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا أَنزِلْ عَلَيْنَا مَائِدَةً مِّنَ السَّمَاءِ تَكُونُ لَنَا عِيدًا لِّأَوَّلِنَا وَآخِرِنَا وَآيَةً مِّنكَ وَارْزُقْنَا وَأَنتَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ)[المائدة/١١٤]** واتە: جا عیسای کوڕی مەریەم گووتی: ئەی پەروەردگاری ئێمە نان و خوانێکمان لە ئاسمانەوە بۆ بێنە خوارێ تا ببێتە جەژنێک لەناوماندا، بۆ ئەوانەی ئێستامان و ئەوانەی بەدواشماندا دێن و وەک و بەڵگە نیشانەیەکیش وابێت لەلایەن تۆوە، بژێویمان پێبدە بەڕاستی تۆ چاکترین بژێوی دەری.، جا هەم پێغەمبەر عیسا دانی بەوەدانا ئەوان گومانیان نەبوو هەمیش الله تعالى بەڕاستی خستنەوە و باسی کرد و داواکەی بۆ جێبەجێ کردن، جا چۆن و بە چ عەقڵێک و بیرکردنەوەیەک و تێگەیشتنێک هاتوون ئەم قسانە دەکەن بۆ سەرخستنی باطڵەکانتان؟ بەڕاستی باطڵ هەمیشە سەرەنجامی سەرشۆڕیە

جا پاشان دەچینە سەر تەفسیر و ووتەی صحابە و مفەسیرەکان دەربارەی ئەم ئایەتە بزانین ئەوان بە چ شێوەیەک لێی تێگەیشتون

قاسمی مفسیر دەربارەی کۆدەنگی مفسیران لەبارەی حەواریەکان کەوا گومانیان لە توانای الله تعالى نەبوە نەقڵ دەکات و دەڵێت:

(زۆربەی موفەسیرەکان دەڵێن: سەرنجدان لە ووتنەکەی سەرەتایە-مەبەست**(هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ)** هەڵگرتنی خوازی ئەوانە، کەس ناتوانێت تۆمەت بخاتە سەر حەواریەکان کەوا گومانیان هەبوبێ لە توانای الله تعالى، بەڵکو وەک و ووتەی کەسێکە بۆ هاوڕێکەی: دەتوانیت لە گەڵم هەڵبستی؟ خۆ دەیزانی دەتوانێ هەڵبستی لەگەڵی بەڵام تەنها بۆ گەیاندنی داواکردنەکەی بوو وای ووت، وە هەروەها مەبەست**(هَلْ يَسْتَطِيعُ)** واتا ئایا بۆت ئاسان و سوکە ئەنجامی بدەیت لە گەڵم؟ وە بەهەمان شێوە مانای ئایەتەکە، لەبەر ئەوەی حەواریەکان ئیماندار بوون الله عز وجل ـیان ناسیبوو، وە تەواوێتی تواناکەییان ناسیبوو، وە داواکەشیان بۆ دەرخستنی گومان نەبوو، بەڵکو بۆ گەیاندنی زیاتر دڵنیا بونەوەیان بوو، هەروەک و پێغەمبەر ئیبراهیم علیه السلام ووتی: **((قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي)** گومان لەوەدا نیە پاشاوەی

سەیرکردنی ئەم ئایەتە دڵنیا بونەوەیەکە بۆ دڵ، وە لەبەر ئەم هۆکارە ووتیان : **(وَتَطْمَئِنَّ قُلُوبُنَا)** گرتنەوەی**(هَلْ يَسْتَطِيعُ)** پرسیارکردن لەبارەی کردار بەبێ تواناکەی لەسەری  نیشان دەدەات لەسەر پێویستیەکانیان، یان هۆکارێک بە هۆکارەکەی، دەڵێین: مانای:ئایا پەروەردگارت دەتوانێ، واتا: ئایا وەڵامت دەداتەوە گەر داوای لێبکەی؟ (فیستطیع):واتا (یطیع) هەردووکیان یەک مانان)[محاسن التأويل للإمام القاسمي ٤٢٨/٦]

٢-موفەسیر اثیرالدین ابو الحیان دەربارەی کۆدەنگی زۆرینەی موفەسیرەکان لەسەر ئەوەی حەواریەکان گومانیان نەبوە لە توانای الرب العالمین، دەڵێت:(وە ئەم دەربڕینە- **(هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ)**-لەڕوی ئاشکرایی وا دەردەکەوێت کەوا گومانیان لەتوانای الله تعالی هەبوە لە هێنانە خوارەوەی ئەم خوانە لەئاسمانەوە، لە زەمخەشری و جگە لەوانیش لە ئەهلی تەرفسیر دان بەوە دادەنێن حەواریەکان ئیماندار بوون، بەڵکو ئەمە تایبەت مەندیەکی عیسا بوو، وە ئەوانیش گومانیان لەووە نەبوو، تا حەسەن دەڵێت: گومانیان لە توانای الله تعالی نەبوو، بەڵکو پرسیاریان کرد هەواڵیان پێ بدات ئایا دا دەبەزێت یان نا؟ ئەوەبۆمان پرسیار بکە)[البحر المحيط لأبي حيان ٥٣/٤]

جا ئەوەمان بۆ ڕوونبویەوە کەوا مەزهەبی موفەسیرەکان لەگەڵ ئەوەدانە کەوا حەواریەکان گومانیان لە توانای الله تعالی نەبوە، جا لە ڕونکردنەوی**(هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ)** بەچەند ڕوێک باسی لێوەدەکەن و دایان دەنێین:

یەکەم: حەواریەکان ووتیان ئایا دەتوانی داوا لە پەروەردگارت بکەی؟ حەواریەکان گومانیان لە توانای الله تعالی نەبوە بەڵکو بەو مانایەیە: ئایا دەتوانای داوا لە پەروەردگارت بکەی؟ یان ئایا پەروەردگارت پێت دەدات ئەگەر داوای لێ بکەی؟ کەوا لەمانەشدا هیچ گومانێک نیە لە توانای الله تعالی ـــدا:

١- لەدایکە عائیشەوە{رضي الله عنه} دەڵێت:( حەواریەکان گومانیان لە توانای الله نەبوە لە دابەزاندنی خوانەکە، بەڵکو ووتیان: ئایا پەروەردگارت پێت دەدات؟)[القرطبي ٢٣٧٦/٣]

وە لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتوە لە [ابن ابي حاتم و ابن جرير و ابن المنذر وابن ابي شيبة] لە عائیشەوە{رضي الله عنه} کەوا دەڵێت:(حەواریەکان زانابوون بە الله لەوەی ووتیان: ئایا

پەروەردگارت دەتوانێ؟ بەڵکو ووتیان:ئایا پەروەردگارت پێت دەدات، واتا ئایا دەتوانی داوای لێ بکەی؟)[تفسير السيوطي ٢/٣٤٦]

٢-لە عامری شعیبی هاتووە کەوا عەلی{رضي الله عنه} ئەمەی دەخوێندەوە(**هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ**) دەیووت:واتا ئایا پەروەدگار بەقسەت دەکات؟)[تفسير السيوطي ٣٤٦/٢]

٣-ئیبن جریر لە سەدیەهێناویەتی دەڵێت:ووتەی(**هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ**)سەدی دەڵێت:(ووتیان: ئایا پەروەردگار بەقسەت دەکات گەر داوات لێی کرد؟ جا الله تعالی خوانێکی بۆ دابەزاندن لەئاسمانەوە کەوا گشت خواردنێکی تێدا بوو تەنها گۆشت نەبێت)[البحر المحيط ٥٣/٤]

٤-ئەبو عوبەید و ئیبن جریر دەگێڕنەوە لە سەعیدی کوڕی جوبەیر ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە(**هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ**) ووتی:( واتا: ئایا دەتوانی داوا لە پەروەردگارت بکەی)[البحر المحيط ٥٣/٤]

٥-حەسەنی بەصری دەڵێت:(گومانیان نەبوو لە توانای الله تعالی ـدا، بەڵکو داوایان لێکرد بە داواکردنی هەواڵێک: ئایا دادەبەزێ یان نا؟ ئەگەر دا دەبەزێ ئەوە بۆمان داوابکە)[الدرر المنثور ٢٤٩]

٦-ئیبن عطیەی مفسیر دەڵێت:(ئایا الله تعالی وامان بۆ دەکات ئایا وەڵامان دەداتەوە، هەروەک و بە عبدالله ـی کوڕی زەید ووترا: ئایا دەتوانی نیشانم دەیت رسول الله چۆن دەستنوێژی دەگرت)[البحر المحيط ٥٣/٤]

٧-فراء لە [المعاني القران] دەڵێت:(باسکراو لە مەعاذ ـەوە ووتویەتی: رسول الله صلى الله عليه وسلم بۆی خوێندمەوە بە(**هَلْ تَسْتَطِيعُ رَبَّكَ**) بە(تاء) ئەمە ڕوێکی چاکە، واتا ئایا دەتوانی داوامان بۆ بکەی پەروەردگار خوانێکمان ـبۆ لەئاسمان بێنێتە خوارەوە؟)[تفسير القرطبي ٢٣٦٢/٣]

٨-ئیبن کەثیر دەڵێت:(حەواریەکان کەوا شوێنکەوتەی عیسا بوون ووتیان(**هَلْ يسْتَطِيعُ رَبُّكَ**) ئەمە خوێندنەوەی زۆرێکیانە، وەخوێندنەوەی ئەوانەی تر:(هَلْ تسْتَطِيعُ رَبَّكَ) واتا:ئایا دەتوانی داوا لە پەروەردگارت بکەی؟)[ابن الكثير ١١٧/٢]

٩-زەجاج {رحمە اللە} دەڵێت:( واتای: ئایە داوای لێ دەكەی بۆ ئەوەی ئاسانی بكات، وە دەڵێن: ئایا دەتوانی داوا لە پەروەردگارت بكەی یانئاسانی بكەی، ماناكەیان لێک نزیكە، وەلانەدراوە، هەروەک و اللە تعالی دەفەرموێت(وسئل القریة)[یوسف/٨٢]وەلەسەر خوێندنەوەی یاء پێویست بەلادانی ناكات)[التفسیر الواضح ١٢٩/١]

١٠-ابن القیمیۍ جوزیۍ دەڵێت:(ووتەی: **(هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ)** زەجاج دەڵێت: ئایا دەتوانیۍ؟ وە كەسائی دەخوێنێتەوە بە(هَلْ تسْتَطِيعُ رَبُّكَ) بە( ت ) دانانێک بۆ پەروەردگار، وە فراء دەڵێت: مانای ئایا تۆ دەتوانی داوا لە پەروەردگارت بكەی؟ ئیبن الأنباریۍ دەڵێت: بۆ هیچ یەكێكتان ڕێگە نەدراوە تۆمەت بخەنە سەر حەواریەكان بەوەی گومانیان لە توانای اللە هەبوە، ئەمە وەک و ئەوەیە كە مرۆڤ بە هاوڕێكەی دەڵێت: دەتوانیت لە گەڵم هەڵبستی و ئەنجامی بدەی؟ خۆ دەزانیۍ دەتوانیۍ لە گەڵی بكات- بەڵام دەیهەوێت: ئایا ئاسانە بۆت ؟ وە ئەبو عەلیۍ دەڵێت:ئایا ئەم كارە دەكەی بە داواكردن؟، جا هەندێک پێیان وایە ئەم ووتەیەیان پێش ئیمان هێنانیان بوو، وەڵامیان درایەوە بە ووتەی عیسا بۆیان: **(اتَّقُوا اللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ)** [زاد المسیر في علم التفسیرللحافظ ابن الجوزي ٤٥٥/٢]

ئەمەش تەفسیر و ڕونكردنەوەی هاوەڵانی رسول اللە بوو كەوا بە پلەی دووەم دێن لەپاش تەفسیری رسول اللە وە هەروەها تەفسیری تابیعین و پاش ئەوانیش بون، بەڵام بۆ زیاتر درێژ نەكردنەوەی دە دانەم دانا بۆ بەرچاوڕوونی خوێنەر، گەر نا ووتەی موفەسیران لەم ڕووەوە زۆرە و كۆدەنگیان تێیدا هەیە زۆرینەی، وە هەندێكیان هەر بۆ خوێندنەوەش هەر بە تاء دەیخوێننەوە سەرەتای (هل تستطیع) وەک و ابن الجزریۍ وە ابن المجاهد لە قیرائەتی عشرە و سبعە قیرائەت، بەڵام ڕاستر وایە بە(هل یستطیع)بخوێندرێتەوە وە ماناكەشی وا تەفسیر بكریۍ بە (هل تستطیع)

دووەم: بەشێک لە موفەسیران ووتەی اللە تعالی**(هَلْ تسْتَطِيعُ رَبُّكَ)** بەواتای: ئایا ئاسانە بۆت پرسیار لە پەروەردگارت بكەی؟ لێكی دەدەنەوە، هەروەک و باسمان كرد لە ووتەی زانایان كەوا بە تێگەیشتوانە و نمونەیەكی زۆر جوان ڕونی دەكەنەوە، وەک كەسێ بە هاوڕێكەی بڵێ دەتوانی ئەوەم لە گەڵ ئەنجام بدەیت؟ خۆی دەزانیۍ دەتوانیۍ بەڵام بە ڕووێكی تر وای پێ

دەڵێ ئایا دەتوانی لەگەڵم ئەنجامی بدەی؟ مانای وانادا نەتوانێ، بەڵکو لات ئاساییە لات چاکە و ئاسانە بتوانی لەگەڵم بێی لەگەڵم ئەنجامی بدەی.؟

١-فراء دەڵێت:( وە ووتەی: **(هَلْ يسْتَطِيعُ رَبُّكَ)** ئەهلی مەدینە و عاصمی کوڕی ئەبی نجود و ئەعمەش بەیاء دەیخوێننەوە**(هَلْ يسْتَطِيعُ)**بەڵام لەسەر ئەو ووتەیە کە دەیڵێی: ئایا فلانە دەتوانێ لەگەڵم ئەنجامی بدات؟وەتۆش دەزانی دەتوانێ، ئەمە لەڕوێکەوە، وە باس کراوە لە عائیشە و علی کەوا بەم جۆرە خوێندویانەتەوە**(هَلْ تسْتَطِيعُ رَبَّكَ)**بە تاء، وە لە مەعاذ ـەوە هاتووە کەوا رسول الله بۆی خوێندۆتەوە بە**(هَلْ تسْتَطِيعُ رَبَّكَ)** بە تاء- ئەمە ڕوێکی چاکترە، واتا: ئایا دەتوانی داوای لە پەروەردگارت بکەیت ئەم خوانەمان لە ئاسمانەوە بۆ دابەزێنێت؟)[معاني القران للإمام الفراء ٣٢٥/١]

٢-ئیمامی بغوی دەڵێت:(وەخوێندنەوەی ئەوانەی تر**(يسْتَطِيعُ)** بە یاء- وە(ربک) باء بەرزدەکەنەوە وە هیچ گومانێکیان لە توانای الله تعالی نەبوو، بەڵکو مانای وایە ئایا پەروەردگارت بۆت دادەبەزێنێ یان نا؟ هەروەک و پیاوێک بەهاوڕێکەی دەڵێت: ئایادەتوانی لەگەڵم بەرزی کەیەوە؟ لەگەڵ ئەوەی دەشزانێ دەتوانێ، بەڵام مەبەستی ئەو لەوەیە ئایا دەت هەوێت بیکەی یان نا؟)[معالم التنزيل ٧٧/٢]

جا بەگشتی ئەهلی علم و تایبەت موفەسیران کۆکن لەسەر ئەوەی باسمان لێوە کردن، وە هەرئەوەندە نیە ووتەکانیان بەڵکو زۆر زیاترن لەبەر درێژ نەکردنەوەی بابەتە ئاوام دانا، بەڵام بۆ زانیاریتان ئەوانەی لەسەر ئەم ڕایەن بریتین لە:(عائیشە- علي بن ابي طالب - سعید بن الجبیر- السدی والمجاهد-الحسن البصری- احمد بن الحنبل - ابن النحاس- البغوی - ابن الجوزی - الفراء - ابن الحصار- ابن الانباری -ابن عطیة-الفرسی المفسیر- الصاوي -شهاب الخفافي- ابن جزي صاحب-ناصرالدين احمد بن المنير المالکی-الخطیب الشربي- الاما السیوطي-ابن الکثیر -مراغي....)زۆری تر، وە هەروەک و لە سەرەتادا ووتەی قاسمی و ابواثرالدين ـمان نەقڵ کرد کەوا نەقڵی ئیجماعی موفەسیرانی کردبوو لەسەر ئەم ڕایەدا، جا هەم بەو تێگەیشتن و لێکدانەوەی خۆیاا کە کردبویان بە گومان وەڵامیان وەرگرت وە هەمیش لە ڕووی زمانەوانی و شەرعەوە وەڵامی گومانەکانیان درایە والله الحمد والمنه

کۆتایی بەم بابەتە دێنم بە ووتەی ئیمامی سعدی{رحمه الله} لەتەفسیرەکەی دا دەڵێت)وە ئەمانە هیچ گومانێکیان لە توانا و گوێڕایەڵی الله تعالی نەبوو بەڵکو ئەم ووتەیەیان لە بابەتی نیشاندانی ئەدەب و ڕێزیان بوو)[تفسير السعدي/٢١٠]

## گومانی حەوتەم: ئەو پیاوەی میزی لە مزگەوت کرد

(لە ئەنەسی کوڕی مالکەوە خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕنەوە دەلێ: دەشتەکییەک هات ، میزی کرد لە لایەکی مزگەوت ، خەلکی ڕووشکێنیان کردوو و بە توندی ڕەفتاریان لەگەڵ دا کرد ، پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێت ڕێگری لێ کردن و قەدەغەی کردن کاتێک کە میزەکەی تەواو کرد پێغەمبەر فەرمانی کرد جامێک ئاو بێنن ، ڕژێنرا بە سەریان-)متفق عليه

ئەمجارە موبتەدیعەکانی ئاخر زەمان گومانێکی نوێتریان داناو بەعەقڵی خۆیان لەوەی پێشتر بۆیان داناون، گومانەکەشیان ئەوەیە دەڵێن ئەم دەشتەکیە میزی لە لایەکی مزگەوت کرد و رسول الله صلی الله علیه وسلم ڕێگەی نەدا صەحابیەکانی ڕێگای لێ بگرن و عوزری بۆ هێنایەوە جاهیل بوو..!!

لە وەڵامی ئەم گومانە باطڵەشدا بەچەند ڕویێک دەیخەینە بەردەم خوێنەر:

یەکەم: ئەوان وا تێگەیشتوون کەوا صحابیەکان تەکفیریان کردوە و رسول الله ـیش ڕێگری لێی کردون.!!، نەخێر بەڵکو صحابیەکان نە تەکفیریان کرد نە ویستیان بیکوژن بەڵکو ویستیان ڕێگری لێ بکەن لە پیسکردنی مزگەوت  و رسول الله ـیش ڕێگری لێ کردن، هیچ شتێکلەمانە نەبوە نە ناوی کوفر لەسەری جێگیر بێ نە حوکمی ڕیدەی کوفر بەسەری دا جێگیرکرابێ و رسول الله ـیش ڕێگری لێکردبن جا چۆن بە چ تێگەیشتنێک بۆخۆتان واتان لێ کردوە و دەیکەن بەڵگە بۆ ئەمە کەوا نە تەکفیری تێدایە نە کوشتن؟!، کەوا هیچیان پەیوەندی بەم باسەی کوفر و تکفیر و عوزر بۆ جاهیل نیە

دووەم: بە چ دەلیلێک و بە چ بەڵگەیەک ئەم کارەی ئەم دەشتەکیە بە کوفر دەزانن؟؟ ئایا میز کردن لە لا دیوارێکی مزگەوت کوفرە وەک و ئەوەیئەم پیاوە کردی؟، جا کێشەی ئەمان هەر

لە ضوابطی تکفیر ـدا نیە بەڵکو کێشەی ئەوان لە نەناسینی و کوفر و ئیماندایە جا چۆن مەرج و ڕێگری بۆ دادەنێن.! لە پاش ئەوەی ئەم کارەی کرد رسول الله بانگی کرد پێی فەرموو:(ئەمە مزگەوتە درووست نیە تێیدا نە میز نە پیسی تێدا بکەی، بەڵکو مزگەوت بۆ یادکردنەوەی الله تعالی ـیە و نوێژ کردن و خوێندنەوەی قوڕئانە) رسول الله هەر نەک تەکفیری بکا بەڵکو کارەکەشی بەکوفر نەزانی تا وەک و پێی ڕابگەیەنێ ئەم کارە کوفرە مەیکە نا تەنها پێی ووت درووست لێرە بیکەی لەبەر ئەوەی شوێنی زیکر و نوێژ و خوێندنەوەی قوڕئانە، وە ئەم فەرمودەیەش بەڵگەیە لەسەر حەڕامێتی و ڕێگە پێنەدانی میز کردن لە مزگەوت هەروەک و ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ، وە زۆرینەی فوقهـاکان ئەم فەرمودەیە دەکەن بە بەڵگە لەسەر ئەوەی میزکرن لەمزگەوت ڕێگە پێنەدراوە تەنها بۆ کاتی زۆر بۆهاتنبێت و ناچار بێ وەک و ئەم دەشتەکیە.

سێیەم: ڕێگری کردنەکەی پێغەمبەر لەبەر هیچ کارێکی نە ئیمان نە کوفری نەبوو بەڵکو ڕێگری کردنەکەی زانایان ئەم قاعیدەیەی بۆ دێننەوە: ئەگەر دوو زیان هاتە پێشت دەبێت ئەوە هەلبژێریت ئەوەی کەمترین زیانی هەیە، جازانایان دەڵێن لەبەر ئەوە رسول الله صلی الله علیه وسلم فەرمانیکرد وازی لێ بهێنن چونکە زیانی زیاتر بوو بە ڕێگری لێ کردنی ئەمەش لەبەر چەند هۆیەک:

١-ڕێگری کردنەکەیان دەبوە بڕینی میزی کەوا ئەمە زیانی بۆ جەستەی هەیە تایبەت ئەگەر میزی زۆربێت

٢-ئەگەر ڕێگری کرابا ئەوە ئەگەری زۆری هەبوو میز بەر جل و بەرگ و لاشەی بکەوتایە بێ نوێژ دەبوو، لەبەر ئەوەی گێڕانەوەیەک هەیە ئەم کابرایە بەر لەم کارەی لە مزگەوت دوو ڕکات نوێژی کردوە، جا بەرجل و بەرگی بکەوتایە جل و بەرگی بێنوێژ دەبوو ئەوکات

٣-لەبەر ئەوەی میزی زۆر دەهات ئەگەر هەبوو کەسەکە گەر ڕێگری لێ کرابا ئەوە شوێنی تریشی پیس کردبا

جا ئەم فەرمودەیە بە هیچ شێوەیەک ناچێتە ناو بابەتی عقیدەدا و پەیوەنی پێوە نیە بەتایبەت بۆ بابەتێکی وا، جا کردەوەی ئەم کابرایە ڕوونە و کوفر نەبو تاوەک و ڕێگری لێ بکرێ وەڕێگری

کردنی رسول الله صلی الله علیه وسلم ـیش لەبەر گێڕانەوەی زەرەری زیاتر بووبۆخۆی و دەوروبەری بە کۆدەنگی زانایان.

## گومانی هەشتەم: بەسەرهاتی حاطب

لە عەلی ـەوە{رضي الله عنه} دەڵێت: رسول الله من و زوبەیر و میقداد{رضي الله عنه}ـی نارد فەرمووی:( بڕۆنە ڕوەضە خاخ لەوێ ئافرەتێکی لێیە نامەیەکی پێیە لێی وەربگرن)، ڕۆیشتین ئەسەکانمان بەردا هەتا گەیشتینە لای ئافرەتەکە، ووتمان نامەکە دەربکە، ووتی: نامەم پێ نییە، ووتمان: نامەکە دەردەکەیت یان جلکەکانت دەگەڕێین، نامەکەی دەرهێنا لەناوپەلکی دابوو، هێنامانەوە بۆ رسول الله، کە نامەیەک بوولە حاطبی کوڕی بەلتەعە بۆ کافری خەڵکی مەککە، هەواڵیان دەداتێ بە هەندێ کاروباری رسول الله، رسول الله پێی فەرموو:(ئەی حاطب ئەمە چییە؟) ووتی: ئەی رسول الله پەلەم لێ مەکە با بۆت ڕوونکبەمەوە، من پیاوێکم خۆم هەڵواسیوە بە قوڕەیش دا، ئەوانەی لەگەڵ تۆدان لە موهاجیران هەموو خزمیان هەیە و کەسەکان بەو خزمایەتیە دەپارێزن، منیش کە خزمم نیە منیش ویستم شتێکیان بۆ بکەم بەڵکو بەو هۆیەوە خێزانەکەم بپارێزم، من ئەوەم نەکردوە لەبەر کوفری یان پاشگەزبونەوە لەدینەکەم یان ڕازی بون بە کوفر دوای موسڵمان بونم، رسول الله فەرمووی:(راست دەکەین) عمر{رضي الله عنه}ـووتی: یارسول الله وازم لێ بهێنە وریێگام دە لەملی ئەم دوڕووە بدەم، رسول الله پێی فەرموو:(ئەی عمر چۆن دەیکوژیت ئەو لە هاوڵانی بەدرە الله تعالی ڕوی قسەی کردۆتە هاوڵانی بەدر چی دەکەن بیکەن من لێیان خۆشبوم، جا الله تعالی ئەم ئایەتەی ڕەوانە کرد(**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ**)[**الممتحنة/١**]واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە دوژمنانی من و خۆتان مەکەن بەدۆستی خۆتان.،))

ئەهلی گومان لەم بەسەرهاتەدا دێن دەڵێن ئەوەتا ئەم صحابیە نەزان بوو وایزانی کارێکی چاک دەکا کە وای کرد رسول الله ـیش تەکفیری نەکرد و هیچی لێ نەکرد بەڵکو عوزری بۆ هێناوە لەگەڵ ئەم کارەشی..!!

جا بەپشتیوانی رب العالمین وەڵامی ئەم گومانە بە چەند خاڵێک دەخەینە ڕوو:

١- دەڵێن حاطب{رضي الله عنه} نەزان بوو بەوەی ئەم کارەی کوفرە بۆیە عوزری بۆهێندرایەوە.!! هەر کەسێک بەدوای ئەم فەرمودەیە گەڕابێت و ئەم فەرمودەیە بزانێت ئەم قسەیە ناکات، لەبەر ئەوەی حاط{رضي الله عنه} خۆی دان بە کوفری دۆستایەتی و یارمەتیدانی کافران دا دەنێ و بە هەڵگەڕانەوە و کوفر ناوی دەهێنێ و دەڵێ:(من ئەوەم نەکردوە لەبەر کوفری یان پاشگەزبونەوە لەدینەکەم یان ڕازی بون بە کوفر دوای موسڵمان بونم)جا ئەمە ووتەی حاطب بوو کەوا نەفی نەزانین دەکات نەیووت نەمزانی وا و وا.. بەڵکو ڕوی ووتەکەی ڕوونە هیچ لێکدانەوەیەک لەخۆی ناگرێت، کارەکەی ئەمیش کوفر نەبوو گەر نا خۆشی دەیزانی یارمەتی دانی کافران بەسەر موسڵمانان دا کوفرە بێ گومان لەخاڵی پاشدا دەچینە سەر کارەکەشی.

٢- کارەکەی حاطب هیچ کوفریەکی تێدا نەبوو تەنها تسەرپێچیەکی گەورە بوو تاوان بار بوو نەوەک کوفر لەبەر ئەوەی ئەوکارەی کردی و نامەکەی تێیدا نوسیبوو هیچ یارمەتیدان و سەرختن و پشتیوانی بۆ کافرانی قورەیشی تێدا نەبوو، جا دەچینە سەر دەقی نامەکەی حاطب کەوا بەشێکی زۆر لە خاوەنانی مەغازی نەقڵی دەکەن لە فتح[٧/٥٢١] دەقی نوسراوەکەی:(ئەی کۆمەڵانی قورەیش، بەڕاستی رسول الله صلی الله علیه وسلم وا بۆتان دێت بە هێزێک وەک و شەوە دەگەڕێن بەلێشاو وەک و لافاون، سوێند بە الله ئەگەر یەکێکیان بۆتان بێت ئەوە سەردەکەوێ بەسەرتان وە وەعدەکەیان بەدەست دێنن، جا سەیری نەفسی خۆتان بکەن و وسلام) جا ئەمە هیچ کوفریەکی تێدا نیە بەڵکو ئەمە خۆی لەخۆیدا شێوازێکە لە جیهاد لە دژیان، ترس خستنە دڵی کافران و دابەزاندنی وورەیان نەفسی تێکدانیان هەروەک و الله تعالی دەفەرموێت: **(وَأَعِدُّوا لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ)[الانفال/٦٠]**واتە:خۆتان ئامادە بکەن و دژایەتیان بکەن ئەوەی لەتواناتان دایە لەکۆکدنەوەی هێز و ئەسپی دابەستراو ۆە دوژمنەکانی خۆتان و دوژمنەکانی الله تعالی ـی پێ بترسێنن.، جا ترساندن و ترس خستنە دڵی کافران واجبە، هەروەک و ئێستاکە موجاهیدان بە کافران دەڵێن: بۆتان ئامادەین بە هێزێک سەرەتاکەی لای ئێمەیەو کۆتاییەکەی لەناوتاندایە، وە قورەیش زۆر دەترسان لەکار و بارەکانی رسول الله وە ئەگەر رسول الله هەڕەشەی لە هەرکەسێک بکردبا ئەو کەسە زەردەخەنە و دڵخۆشی جارانی نەدەما

و ترس و خەفەت دای دەگرت، ئومەییەی کوڕی خەلەف پێیان گووت گوێمان لێبوە محمد وتوویەتی: موسڵمانەکان دەتکوژن لەو ڕۆژەوە زەندەقی چوبوو بڕیاری دابوو لەمەکە نەچتە دەرەوە، بەڵام کاتەک ئەبو جەهل ناچاری کرد بڕواتە دەرەوە چاکترین عوشتیری کڕی لەترسا بۆ ئەوەی بتوانێ ڕابکات و موسڵمانان نەیبینن، جا ئەم کارەی حاطب هیچ کوفریەکی تێدا نەبووە کەوا یارمەتی و سەرخستن بێت بۆ کافران لەدژی موسڵمانان نەخێر بەڵکو بە پێچەوانەوە وەخۆی بەو لێکدانەوەی کردبوی کەوا پێکاویەتی بەڵام لەم جەنگەدا رسول الله نەیدەویست بە هیچ شێوەیەک دوژمن پێی بزانێت بۆیەش دوعای کرد ووتی:(یا الله هەواڵی ئێمەیان لێ وونکەی) بۆیەش الله تعالی داواکەی قەبوڵ کرد و حاطبی ئاشکرا کرد، جا حاطب تاوانبار بوو بە سەرپێچیەکەی ئەو فەرمانەی رسول الله نەوەک کارەکەی کوفر بێت.

٣- حاطب یەکێک بوو لە ئەهلی بەدر، رسول الله لەبەر ئەمە لێپێچینەوە و سزایەی نەدا لەسەر سەرپێچیەکەی لەبەر ئەوەی لە ئەهلی بەدردا بوو کەوا بە ئیمامی عمری فەرموو کاتەک ڕوخسەتی وەرگرت لەملی بدات پێی فەرموو:(ئەی عمر چۆن دەیکوژیت ئەو لە هاوڵانی بەدرە الله تعالی ڕوی قسەی کردۆتە هاوڵانی بەدر چی دەکەن بیکەن من لێیان خۆشبوم) جا عوزر پێدانەکەی بۆ ئەو تاوانەی حاطب لەبەر ئەوە بوو لە ئەهلی بەدر بوو نەوەک نەزان بێت و کوفری کردبێت.

جا بە هیچ شێوەیەک ئەم بەسەرهاتەی حاطب{رضي الله عنه} نابێتەبەڵگە بۆ هێنانەوەی عوزر بۆ هیچ یەکێک بکەوێتە ناو کوفرێکی ئاشکراوە، بەڵکو ئەم بەسەرهاتەی حاطب ڕوونە و هیچ گومانێک لەخۆی هەڵناگرێت وەک و لەسەرەوە ڕونمانکردەوە.

## گومانی نۆیەم: بەسەر هاتی دوو جاریەکە

ڕوبەیعی کچی موعەوویز{رضي الله عنه}دەفەرموێ: کەچووم بە بوکێنی، بەیانی شەوی بوکێنیم رسول الله بۆپیرۆز بایی هات بۆلام، لە جێگەیەی مندا ئەی خالیدی کوڕی زەکوان وەک تۆ لەسەر جێگەی منداداینیشتووی، چەند جاریەکمان هەبوو، دەستیان کرد بە دەف لێدان و سۆز بۆ ئەوانەی لەڕۆژی بەدردا شەهید بوون، هەتا یەکێکیان گووتی: پێغەمبەرێکی وامان

تێدا هەڵکەوتووە دەزانێ کە سبەی چی دەبێ، رسول الله فەرمووی:(وامەڵێ لەپێشدا چیت دەوت ئەوبڵێوە)[صحیح البخاري ٤٠٠١]

ئەوانەی عوزر بۆ کافران دێننەوە لەم فەرمودەیەشدا گومانی خۆیانیان تێ خستوە دەڵێن سەیرکەن رسول الله تەکفیری نەکردن بەڵکو عوزری بۆ هێنانەوە..!!

کێشەکەی ئەوانە لێرە و لە دەقەکانی تردا ئەوەیە دوو بابەتی زۆر لێک جیاوازیان تێکەڵ کردوە و بە یەک مانا لێکی دەدەنەوە

تەکفیری کافران: هەرکەسێ کەوتە نێو کوفرێکی ئاشکرا وڕونەوە ئەوە کوفرەکەی بەسەردا جێگیر دەبێ، جا ڕووبەڕوو پێی بوترێت کافری، یان ئەوەتا بۆ موسڵمانەکانی تر حاڵی دەربخەی و کوفریەکەی بە موسڵمانان بناسێنی

ڕێگری لە کوفر: ڕێگری کردنی رسول الله لە هەرکەسێ بکەوتە نێو هەرکارێک، یان بەر لەکەوتنە نێو ئەم کارانە رسول الله ڕێگری لێیان کردوە، جا کەسێ کە بکەوێتە ناوی ڕێگریکردنەکەی بەر لە تەکفیر کردنی بێ یان دوایی بێت، لەبەر ئەوەی حوکمەکەی جێگیر بووە هیچ جیاوازیەک نیە لەوەی دوایی بێ یان پێشی بێت بەڵگەکان لەسەر کوفریەکە موحەکەم کراون و هیچ تەئویلێک لەخۆی هەڵناگرێ و هەموو موسڵمانان دەزانن کەوتۆتە نێو کوفر و کافرە بەڵام هیچ مەرجێک دانەندراوە لەوەی ئایا دەڕبڕینی تەکفیرکردنیان بەر لە ڕێگری کردنیان بێت یان دوایی ڕێگری لێ کردنیان، بەڵکو ئەوەی جێگیربوە وەک و لە بەڵگەکانی سەرەتا و کۆتا باسمان کرد و دەقەکانمان دانا کە کەسێ بکەوێتە ناو کوفرەوە کوفرەکەی بەسەردا جێگیر دەبێ جا بەر لەهاتنی بەڵگە بۆی یان دوای.

جا کێشەی ئەوانە کەوتونەتە نێو گومان و هەڵەیەکی زۆر ڕوون و ئاشکراوە پێیان وایە ئەگەر رسول الله ڕێگری کەسێکی کرد کە کارەکەی کردوە ئەوە عوزری بۆ هێناوەتەوە جاهیلە.!!

ئەو پیاهەڵدانە بەسەر رسول الله صلى الله عليه وسلم کە ووتی(پێغەمبەرێکی وامان تێدا هەڵکەوتووە دەزانێ کە سبەی چی دەبێ) وەک و زاندراوە پێغەمبەران علمی غەیبیان پێدراوە بەڵام بەشێکی کەوا الله تعالى بەویستی خۆی لە هەندێ شتا ئاگاداری کردونەتەوە هەروەک

و دەفەرموێت: **(عَالِمُ الْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِ أَحَدًا-إِلَّا مَنِ ارْتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ)[الجن/٢٦-٢٧]** واتە: زانایە بە شاراوەکان بۆ هیچ کەس ئەم نهێنیانەی ئاشکرا ناکات- تەنها بەڕەزای خۆی بۆ پێغمبەرێک.، ئەو جاریە بە گشتی قسەکەی کرد واتا لەسنوری ئەوزانینەی رسول الله دەرچوو رسول الله ـیش ڕێگری لێ کرد و ئەمری کرد پێی بگەڕێتەوە لەو قسەیەی، هیچ گومانێکی تێدا نییە رسول الله صلى الله عليه وسلم ئینکاری و ڕێگری لێکردن لەوەی کەووتی، هەر وە و ئیبن حجری عسقلانی{رحمه الله} دەڵێت: ڕێگری کردنیان بەهۆی ستایشکردنەکەی بوو کەوا بە گشتگیری علمی غەیبیان بۆ کرد، جا ئەمە سیفەتێکی تایبەتە ـە الله تعالى، وە لە ڕیوایەتەکەی حماد هاتووە: (هچ کەسێک علمی غەیب نازانێت تەنها الله نەبێت).

جا رسول الله لە هیچ شوێنێک و گێڕانەوەیەک نەیووتوە دەربارەی ئەمانە نەزان بوون عوزریان هەبوو یان چی و..، لەبەر ئەوەی رسول الله گەر عوزر بۆ کەسێک بێنێتەوە ڕوونی دەکاتەوە کەوا ئەم کەسە عوزری هەیە بەم هۆیەوە، وەک و لەگومانەکەی پێشتریان لە فەرمودەی حاطب عوزری بۆ سەرپێچیەکەی هێناوە ووتی:ئەمە لە هاوەڵانی بەدرە الله تعالى ڕوی قسەی کردۆتە ئەوان هەرکارێک دەکەن بیکەن من لێیان خۆشبووم، وە لە هیچ شوێنێ رسول الله نەیووتوە ئەمانە کوفریان کردوە بەڵام جاهیلن کافر نابن عوزریان بۆ هەیە حاشا ئەمە بوختانێکی ئاشکرایە بە رسول الله دەکرێ صلى الله عليه وسلم، ئەم فەرمودەیەش هیچ پەیوەندیەکی بە بابەتی جەهل و عوزر نیە بەڵکو بابەت ڕێگری کردنە لە خەراپە، هیچ کەسێ ئەم گومانە ناکاتە بەڵگە بۆمەسائیلی عوزر بەجەهل مەگەر کەسێکی جاهیل یان کەسێک الله تعالى دڵی پەردەی بەسەردابێ و نەتوانێ لە حەقیقەتی دەقەکان تێبگات، لەبەر ئەوەی ڕوونە و هیچ لێکدانەوە و گومانێک لەخۆی هەڵناگرێت.

## گومانی دەیەم: ئەو جاریەی رسول الله تاقی کردەوە

معاويەی کوڕی حەکەم دەڵێت: هاتمە لای رسول الله بە جاریەکەوە ووتم: ئەی رسول الله لەسەر ملیەتی، ئایا ئازادی بکەم؟ رسول الله پێی فەرموو: الله تعالى لەکوێیە؟ ووتی: لە

ئاسمانە پێی فەرموو: من کێم؟ ووتی: تۆ نێردراوی اللهـی، ئینجا رسول الله فەرمووی: ئازادی بکەن ئیماندارە" جەماعەتی عذر بالجهل تەبعەن هیچ بەڵگەیەکیان لا نیە جا خۆیان بە گومان وابەستە دەکەن و ئەمجارە بەم فەرمودەیەیان گرتووە و دەڵێن: ئەو جاریە لە گەڵ ئەوەی نەزانبوو بە تەوحید تەکفیر نەکرا بەڵکو بەڵێنی ئیمانداریتیەکەی پێ درا..!!!

جا بەر لەوەی بچینە سەر وەڵامی ئەم گومانە، دەچینە سەر گێڕانەوەیەکی تر هەر لەسەر ئەوباسە کەوا سەنەدەکەی بەهێزترە لەوەی پێشوو و صحیحە

(ئەنصاریەک جاریەکی ڕەشی لەگەڵ بوو هاتە لای رسول الله فەرموی: ئەی رسول الله ئیمان لە سەر ملیەتی ئەگەر دەیبینی ئیماندار بێت ئازادی دەکەم، رسول الله پرسیاری لە جاریەکە کرد و فەرموی:(شایەتی دەدەی هیچ پەروەردگارێک نیە جگ لە الله؟) ووتی: بەڵێ، پاشان رسول الله پێی فەرموو:(شاهێدی دەدەی من نێردراوی الله ـبم؟) ووتی:بەڵێ، رسول الله پێی فەرموو:(ئایا یەقینت وایە لەدوای مردن دەگەڕێیەوە لا الله؟) ووتی بەڵێ، رسول الله فەرموی:(ئازادی بکەن)).، ئەم فەرمودەیە لە موصنەفی عبدالرزاق و موطأ ئیمامی مالک دا هاتووە بەسەنەدێکی صحیحەوە.،

جا بەر لەوەی لەسەر ئەم فەرمودەیە بدوێین دەگەڕێینەوە سەر ئەوەی پێشوو، بزانین ئایا هیچ جیاوازیەکی هەیە لە گەڵ فەرمودەی دووەم و لێکدانەوەی ناوەڕۆکی

رسول الله کە پرسیاری الله تعالى لەم جاریە ئیماندارە دەکات و پێی دەڵێت الله لەکوێیە؟ دەڵێت لە ئاسمانە، وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە تەنها بە ئیشارەت پەنجەی بۆ ئاسمان بەرز کردۆتەوە، جا گەورەیی الله تعالى و ناسینی بەرز و گەورە وبەتوانا کەوا هەمان مانا دەدات لەو ووتەیەی کە لەئاسمانە یان بەئیشارەت پەنجەی بەرز کردۆتەوە کەوا مەبەست پێی تاک و تەنهایی و بەرز و پیرۆز ڕاگرتنی زاتی الله تعالى بوە لەلای، وە ئەم تێگەیشتنە و لێکدانەوەش کۆدەنگی زۆرینەی زانایانی لەسەرە.،

ئیبن الجوزی دەڵێت: (بەڕاستی جێگیر بووە لە لای خاوەنانی علم کەوا الله تعالى ئاسمان و زەوی لەخۆ ناگرێت لە پەیوەستبون بەلادان، بەڵکو بەم ئاماژەییەی ناسینی گەورەیدانانی دروستکەری دەردەکەوێت)[البنار الاشهد ص٩٤]

ئیمام ئەبی عبدالله دەڵێت:( وەلەسەر ئەم قاعیدەیە ووتەی الله تعالی**(أَأَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاءِ)[ملك/١٦]** وە ووتەکەی رسول الله بۆ جاریکە(الله تعالی لەکوێیە؟) ووتی: لە ئاسمانە، جا رسول الله هیچ ئینکاریەکی لێی نەکرد، وە ئەوانەی هاوشێوەی ئەمانەن لەسەر ڕوی ئاشکرا نین، بەڵکو لێکدانەوەیەکی درووستی هەیە، هەروەک و زۆرێک لە ئەهلی علم لەکتێبەکانیان دەستیان پێکردوە)[التذكار في افضل الأذكار ص٢٣]

ئیمامی نەوەوی دەڵێت:(ئەم فەرمودەیە لە فەرمودەی سیفاتتە، کە تێیدا دوو مەزهەب هەیە کەوا چەندجار باسم کرد لە کتێبی ئیماندا، یەکەمیان: بیروباوەڕ بون بەوەی الله تعالی هیچ شتێکی هاوشێوەی نییە، وەڕازاندنەوەی ناوی دروستکراوەکانی، دووەم: لێکدانەوە بەوەی پەیوەندی هەیە پێوە، هەرکەسێ وابڵێ ئەو دەڵێ: مەبەست لەوەدا ئەوەیە تاقیکردۆتەوە ئایا ئەو کەسە موەحیدە؟ دان پێدانانیەتی بەوە دروستەکەر بەڕێوەبەرە، خاوەن کار بریتیە لە الله ـی تاک و تەنها، ئەو رب العالمین ـە)[شرح صحيح المسلم]

ئیمامی سیوطی دەڵێت:((پەروەدگارت لەکوێیە؟) واتا: لە چ ڕوێکەوە ڕوی ڕووکاران دەکرێتە الله تعالی؟ (لە ئاسمانە) واتا: ڕووکردنیان لە ئاسمان، ڕوکردنیان بە داواکاری دەزانێت کەوا الله تعالی بونی هەیە، نەوەک جێگیر کردنی شوێنی، بەڵکو دەسەڵات پێدان و تەسلیم بونی)[سنن نسائي ٩٩/٣] علی قاری دەڵێت:( ماناکە بریتییە لەفەرمانکردن و قەدەغەکردن و ڕەحمەت و وەحیەکەی لە ئاسمانەوە هاتوون، هەروەک و ووتەی الله تعالی**(أَأَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاءِ[الملك/١٦]** وە لەبەر ئەوەی لە هەندێ فەرمودەدا هاتووە ئەم ئافرەتە کەسێکی بێدەنگ و کڕ بووە)[مرقاة المصابيح ٤٥٤/٩] وە دەڵێت:((الله تعالی لە کوێیە؟) واتا پەرستراوی بەحەق و وەسفکراو بەسیفاتی کەمال لەکوێیە؟(لەئاسمانە))[مرقاة المصابيح٤٥٥/٩]

ووتەی زانایانی ئە ئومەتە لە لێکدانەوەی ناوەڕۆک و تێگەیشتنیان زۆرە بەم شێوەیە زۆرینەشیان بەڵگە بە سیفاتەکان الله تعالی دێننەوە و وە ئەم ئایەتەش دەکەن بەبەڵگە**(أَأَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاءِ)[ملك/١٦]** کەوا دەیکەنە بەڵگە بۆ ئیمانی ئەو کەسە بەوەی لەئاسماندایە و لێکدانەوەکەیان بە گەورەیی و دروستەکر و بەرزی رب العالمینـە ئەوەی باسمان کرد لە لێکدانەوەی زۆرینەیان بوو لەسەر ناوەڕۆکی فەرمودەکە، بەڵام ئەم جارە ئەگەر فەرمودەکە بە

ڕوکەشی وەربگرین بێ لێکدانەوەی ناوەڕۆکی، هەموو ئومەت لەسەر ئەوە موتەفقن لەوەی هەر دەقێک پوچەڵ کردنەوەی بنچینەکەی بوو ئەوە پشتی پێ نابەسترێ جا لەبەر ئەم قاعیدەیە دەگەڕێنەوە سەر فەرمودەی دووەم کەوا رسول الله شاهێدی پێ داوە و پرسیاری شەهادەکانیلێ کردووە لەبەر ئەوەی ئەگەر لەسەر ڕوی ئاشکراکەیوەری بگرین ئەوە دەبێ ئەمەیان وەربگرین لەبەر ئەوەی گەر بڵێین هەرکەسەک ووتی یان پێی وابوو الله تعالی ئاسمانە ئەوە ئیماندارە ئەوە ڕەت کردنەوەی فەرمودەی متەواتری رسول الله صلی الله علیه وسلم ـە کە دەفەرموێت:(فەرمانم پێکراوە بجەنگم لە گەڵ خەڵکی تا ئەو کاتەی شاهێدی دەدەن کە هیچ پەروەردگارێک شایەنی پەرستن نیە تەنها الله نەبێ وە منیش نێردراوی الله تعالی ـم) جا زانایان دەڵێن ئەگەرلە سەر ڕوی ڕوکەش وەری بگرین فەرمودەی یەکەم ئەوە پوچەڵ کردنەوەی بنچینەی دینە لەبەر ئەوەی یەهود و نەسرانیش دەیانزانی پەروەردگار لە ئاسمانە بەڵام فەرمودەی دووەم مانای شایەتی دان بە لاالەالاالله گشتی عەرەب لێی تێدەگەیشتن کەوا مانا و مەبەست و تێگەیشتن لە لاالەالاالله چۆنە، جا گەر لە سەر ناوەڕۆکی فەرمودەکە وەریگرین بەم شێوەیە کەباسمان کرد مانای تاک و تەنهای و گەورەیی و ئیمان بە رب العالمین ـە بەم شێوەیە وە ئەگەر لەسەر ڕوی ئاشکرای فەرمودەکە وەری بگرین ئەوەپوچەڵ کردنەوەی بنچینەکەیەتی کەوا پێویست دەبێ فەرمودەی دووەم بکرێتە بەڵگە و پشتی پێ ببەسترێ لەبەر ئەوەی هیچ کەس ئیماندار نیە و نایەتە ناو ئیسلام ـەوە تەنها بە دوو شایەتەکە نەبێ هەروەک و لە فەرمودەی دوەم دا پرسیاری شاهێدیەکانی لێ دەکات، جا بە هیچ شێوەیەک ئەم فەرموده مانای وا نادات ئەم جاریە نەزان بوە و تەوحیدی نەبوە و ئازاد کراوە وبەئیماندار ناوهێندرابێ، نەێر بەڵکو ئیماندار و موەحید بوە و تاقیکردنەوەکەی بۆ ئەوە بوو بزاندرێ موەحیدە یا نا هەروەک و ئیمامی نەوەوی باسی لێوە دەکا، جا ئەم جاریەش سەرکەوتوو بوو لە تاقیکردنەوەکەی بۆیە ئازد کرا و بە ئیماندار وەسف کرا، جا تێڕوانین لەم فەرمودەیە بە لێکدانەوەی ناوەڕۆکی یان ئاشکرایی هیچیان بە هیچ شێویەک لەگەڵ ئەو بیرکردنەوە و لێکدانەوە جیاوازەیان ناگونجێت کەوا پێچەوانەی ئوممەتە.

## گومانی یازدە: فەرمودەی دایکە عائیشە{رضي الله عنە}

ئەوانەی عوزر بۆ کەسی نەزان دێننەوە، تەبعەن هیچ بەڵگەیەکیان لانیە بەڵکو هەروەک و الله تعالی پێی ڕاگەیاندین ئەمانە هەر خەریکن و شوێن بەڵگە موتەشابیهەکان کەوتوون، جائەمجارەش گەشتە ئەوحاڵەتە وەک و ڕافیضە پیسەکان تۆمەت بخەنە پاڵ دایکی ئیماندارانی عائیشە{رضي الله عنە} تۆمەتباری دەکەن بەوەی گومانی لە زانستی الله هەبووە لەبەندەکان واتا الله تعالی زانستی تەواو نەبوە بە بەندەکانی والعیاذ بالله!، جا دەڵێن دایکی ئیمانداران ووتویەتی بە پێغەمبەر و پرسیاری لێ کردوە: ئایا کاتێک خەڵکی بێدەنگ دەبن الله پێیاندەزانێت؟ رسول الله ـیش فەرمویتی بەڵێ!!، جا دەڵێن سەیرکەن چۆن عائیشە گومانی لە زانستی الله هەبوە و رسول الله عوزری بۆ هێناوەتەوە و حوکمی کوفری لەسەرنەداوە-سبحان الله فەرموودەکە دورودرێژە بەڵام بۆ ڕوون بون لە خوێنەر و نەهێشتنی ئەم گومانە فەرمودەکە وەک وخۆی دای دەنێین، ئیمامی موسلیم لە صحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردوە:

{ڕۆژێک محمدی کوڕی قەیس ووتی:ئایا دەربارەی خۆم ودایکم شتێکتان بۆ بگێڕمەوە، ئەوانیش ووتیان وامانزانی ئەودایکەدەڵێت کەلێی بووە.. ئەویش ووتی:ئەو شەوەی کە نۆرەم بوو کەپێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لام بمێنێتەوە هات و عەباکەی دانا و نەعلەکانی داکەند و لای قاچی دارینا لایەکی کراسەکەی ڕاخست و ڕاکشا، زۆری پێنەچوو وای زانی خەوم لێ کەوتوە بەهێواشی عەباکەی کۆکردەوە و نەعەلەکانی لەپێ کرد و لەسەرخۆ دەرگاکەی کردەوە و چوە دەرەوە و لەسەر خۆ دایخست، منیش کاسەکەم لەبەرکرد و پەشتەماڵەکەم کردە ڕوو پۆش و شوێنی کەوتم هەتا گەیشتە بەقیع، ئەوسا بینیم وەستا و زۆریش وەستا، سێجار دەستەکانی بەرزکردەوە ئینجا لایدا،منیش لامدا ئەو پەلەی کرد منیش پەلەم دەکرد ئەو زیاتر پێیهەڵدەگرت منیش زیاتر پێم هەڵدەگرت، ئەوڕای کرد منیش ڕام کرد و پێشی کەوتم چومە ژورەوە و خێرا ڕاکشام، ئەویش هاتە ژورەوە و فەرمووی:(ئەوە چیتە عائیشە وا هەناسە بڕکێتە) منیش ووتم:هیچ نییە، فەرموی:(یان پێم دەڵێی یان زاتی لطیف و ئاگا پێم دەڵێت)منیش ووتم ئەی رسول الله ... ئەی خۆشەویستتر لەباوک و دایکم ئیتر هەموو شتێکم بۆ گێڕایەوە،ئەویش فەرموی:(کەواتە ئەو تارماییەی کەلە پێشمەوە دەم بینی تۆ بویت؟)ووتم

بەڵێ، جا هەردووی دەستی ماڵی بەسینگمدا و ئێشی پێگەیاندم، ئینجا فەرموی:( وات زانی الله و رسولەکەی ستەمت لێدەکەن؟) منیش ووتم: هەرچەندە خەڵکی نهێنیەکانیان بشارنەوە و الله تعالى ئاگەی لێیەتی.. ئینجا فەرموی:(جوبرەئیل علیه السلام هاتە لام بانگی کردم لەتۆی شاردەوە، منیش وەڵامم دایەوە و لەتۆم شاردەوە، ئەو نەدەکرا بێتە ژورەوە لەبەر ئەوەی تۆ پۆشاکەکانت دانابو، من وام زانی تۆ خەوتوویت، حەزم نەکرد خەبەرت بکەمەوە و ترسام لەوەی کە بەتەنهایی بترسیت.، جوبرەئیل پێی ووتم:پەروەوەردگارت فەرمانت پێ ڕەکات بچی بۆ لای خەڵکی بەقیع و داوای لێ خۆشبونیان بۆ بکەیت)عائیشە ووتی:ئەی من چیان پێ بڵێم ئەی رسول الله صلی الله علیه وسلم؟ فەرمووی:(بڵێ:سڵاوتان لێ بێت ئەی خەڵکی ئەم شوێنە لە موسڵمانان و ئیمانداران الله ڕەحم بکات بەوانەی کە زوو مردون و ڕۆشتون بەوانەشمان کە هێشتا ماون، بەدڵنیاییەوە ئێمەش هەرکاتی الله ویستی لەسەر بێت بەئێوە دەگەین))

جا مەبەستی ئەوان لەم دەقەیە:{مهما یکتم الناس یعلمه الله نعم قال:فإن جبریل علیه السلام أتاني....}

واتە:هەرچەندە خەڵکی نهێنیەکانیان بشارنەوە و الله تعالى ئاگەی لێیەتی

ئەم فەرمودەیەش صحیحە ئیمامی موسلیم لە صەحیحەکەیدا هێناویەتی، وە عبدالرزاق لە موصنەفەکەیدا هێناویەتی، وە ئیمامی ئەحمەد لە موسنەدەکەی، وە ئیمامی بەیهەقی لە سونەنەکەی.

بەڵام جیاوازی لە دەربڕینی گێڕانەوەکە هەیە لێرەدا:{مهما یکتم الناس یعلمه الله نعم قال:فإن جبریل علیه السلام أتاني....}

گێڕانەوەکانیش دەبنە چەند بەشێک

١-بەشی یەکەم:ئەوەیە کەوا ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە صحیەکەیدا[٧/٤١-٤٤] لەدەربڕینەکەی بەم شێوەیە کە سەرەتا دامان نا:{مهما یکتم الناس یعلمه الله نعم قال:فإن جبریل علیه السلام أتاني....} ووشەی{نعم}بەر لە {قال} هاتوو، وە ئیمامی عبدالرزاق ـیش بەم شێوەیە هێناویەتی لە موصنەفەکەیدا[٣/٥٧٠]بە هەمان شێوەی ئیمامی موسلیم کەوا

موتەفقن تێیدا کەوا دەربڕینی{نعم}بەر لە {قال} هاتوو، کەوا ئەمەش واتای ئەوەیە تەواوکەری ووتەکەی عائیشە بووە{رضي الله عنه}

٢-بەشی دووەم: نەسائی هێناویەتی لە سونەنەکەیدا[٧٤/٧]، وا ئیمامی احمدیش هێناویەتی[٢٢١/٦] بەهەمان شێوەی موسلیم و عبدالرزاق، بەڵام جیاوازیەکە لەم دەربڕینی ئەم ووتەیەی عائیشە دایە:{مهما يكتم الناس يعلمه الله قال: نعم فإن جبريل عليه السلام أتاني....} جیاوازیەکەیان لێرەدا ئەوەیە ووشەی{قال}بەر لە {نعم} هاتوە کەوا ئەمەش واتای وایە ووتەی رسول الله بووە صلى الله عليه وسلم.

٣-بەشی سێیەم: ئیمامی نەسائی گێڕاویەتیەوە لە سونەنەکەیدا [٩١/٤] لە بابەتی جەنازەدا، بەهەمان شێوەی ئەوانە تر بەڵام جیاوازیەکەی لێردا ئەوەیە:{مهما يكتم الناس يعلمه الله قال:فإن جبريل عليه السلام أتاني....} ووشەی{نعم} ـیتێدا نەهێناوە، جگە لەوەی لە بەشی غیرەدا{نعم}هێناوە وەک و لە بەشی دوەمدا باسمان کرد.

جا بۆیە بەم سێ جۆرە گێڕانەوەکەم داناوە بۆ ڕوون بونەوە لەوەی گومانیان تێدا دروست کردوە کە دەڵێن دایکە عائیشە{رضي الله عنه} ووتویەتی:لەکاتی خەڵکی شاراوەی دەکەن ئایا الله دەیزانێ؟!! رسول الله ـیش ووتویەتی:بەڵێ، دەڵێن لێرەدا دایکە عائیشە نەزان بوە و عوزری پێ دراوە!!جا دێینە سەری ان شاءالله کەوا لە هەر سێ جۆر ڕیوایەتەکاندا مانای ئەوە نادات ڕونی دەکەینەوە

بۆ ئەوەی بزانین لەلای ئەهلی علم کامە ڕیوایەت قەبوڵ کراوە بە ڕاستتر دادەندرێت لەبەر ئەوەی ناکرێ هەموو ئەم دەربڕینانە لە یەک کاتدا ووترابن،جا بە چەند خاڵێک ڕونی دەکەینەوە:

١-بەرزی و بەهێزی سەنەدەکە، دەبێ لەم نێوەندەی جیاوازی تێکەوتوە سەندی یەکێکیان بەرزتر بێت، لەبەر ئەوەی کامە بەرزتربێت کەمتر ئەگەری هەڵە و تێکەڵکردنی هەیە لە گێڕانەوەکەیدا، جا ئەو سەنەدەی هاتوە لە عبدالرزاقەوە بەرزە و چاکترە لەبەرئەوەی ژمارەی گێڕانەوەکان دوو کەسن کە بریتین لە:ئیبن جريج و محمد ابن قەیس، بەڵام ئەوانەی لە نەسائی هاتون لەپێنج ڕێگاوە هاتووە، وە ئەوەی تریشیان هی نەسائی لەگێڕانەوەی،دوەمیدا

بەهەمان شێوە لەڕێگای پێنج کەسەوە هاتوو، گێڕانەوەکەی عبدالرزاق بەم شێوەیە هاتووە:((ابن جريج)بۆی گێڕامەوە ووتی:(محمد بن قەیس بن مخزومة) بۆی گێڕامەوە ووتی:گوێم لە عائیشە بووە... جا ئەمە بەرزترە لەبەر ئەوەی ژمارەی گێڕەووەکانی کەمترن لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم لە گێڕانەوەکەی عائیشەدا، جا ئەوەمان بۆ جێگیر بوو کەوا دەربڕینی ووشەی{نعم}بەر لە{قال}ـە هاتووە، ئەمەش واتای تەواو کەری ووتەکەی دایکە عائیشە بووە، جا ئەهلی عیلم دەگەڕێنەوە بۆ ئەمە لەبەر کەمی گێڕانەوەکەی کەوا دوورە لە هەڵە وهەڵبستن، بە جیاواز لە گێڕانەوەکانی نەسائی و ئەحمەد کەوا ژمارەی گێڕانەوەکەیان زۆرە ئەگەر هەڵە و هەڵبەستن و شێوانی تێدایە و زیاترە.

٢-لە یەکێک لە دو صحیحەکەدا هاتبێ{مسلم}و{بخاري}، کەوا ئەهلی علم گێڕانەوەکەیئەوان لەپێشتر دادەنێن لە گەڵ گێڕانەوەکانی تردا، جا لێرەشدا ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە دەربڕینی ووشەی{نعم} لەتەواوکەری ووتەی عائیشە بووە{رضي الله عنه} هەر وەک و لەبەشی یەکەمی گێڕانەوەکەدا دامان نا موسلیم هێناوەیەتی لەصیحەکەیدا،ووشەی{نعم}بەر لە {قال} هاتوو.

٣-توندی ڕاوی لە ڕێکخستن و تەواوێتی گێڕانەوەکاندا و نەبونی هیچ کێشەیەک تێیدا لە دەربڕینەکاندا لەبەر ئەوەی کێشە هەبونتێیدا مانای لاوازی گێڕەوەکەیە لە گێڕانەوەدا،جا بینیبان ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردوە، جا لەلای ئەهلی علم زاندراوە کەوا ئیمامی موسلیم زۆر چاک بووە لەوانەی تری خاوەن کتێبی فەرمودە لەسەر توند بونی لە تەواوێتی دەربڕینەکان، هەروەک و ئیمامی نەوەوی دەڵێت:(هەرکەسێک بڕوانێتە صحیحی موسلیم وە ئەوانە بخوێنێتەوە لە هێنانی سەنەدەکە و ڕێکخستنەکانی و جوانی بەدواداچونەکانی و نەبونی هاوشێوەی لەڕێگاکەی، لە لێپچینەوە بەنرخەکەی وە گەوهەری پشکنینەکەی وە جۆراوجۆری لە الله ترسی وە پارێزیەکەی و لێکۆڵینەوەکانی بۆ گێڕەوەکان، وە نیەتپاکی ڕێگاکەی و کورتکردنەوەی و تەواوێتی جیاکردنەوەکانی و.. دەزانی  کەوا ئەم ئیمامە لەو سەردەمەی خۆیدا نەبوە وەک وئەو، وەکەمی هاوشێوەی، وەسەرزەنشتکردنی خەڵکی ئەوکاتی و سەردەمەکەی)وە ابن حجری عسقلانی ـیش بەهەمان شێوە دەربارەی دەڵێت کەوا

لەئاستبەرزی هاوشێوەی نەبوەلەتوندی لەسەر تەواوێتی گێڕانەوەکان و مەتنی فەرمودەکاندا، بۆیە لەوەشدا هەر بەشی یەکەمی گێڕانەوەی ئەو فەرمودەیە قەبوڵ دەکەین و جێگیری دەکەی کەوا دەربڕینی ووشەی {نعم}تەواوکەری ووتەی دایکە عائیشە بووە.

٤-موافق بوونی لە گەڵ شەرع و هەست بە جیاواز نەبونی لە گەڵ صحابیەکاندا بکرێ، وەک و ئیمامی سیوطی دەربارەی ئەمەوە دەڵێت:(وەبەشی حەفت:گەڕانەوە بۆ فەرمانی دەرەوەی، وەک و پێشخستنی ئەوەی قوڕئان بەئاشکرا موافقە لەگەڵ، یان سوننەت، یان ئەوەی بەر لە شەرح یان قیاس یاا کردەوەی ئومەت یا خولەفاکانی ڕاشیدین یا پێغەمبەرانی تر یان بڕاوەبێت، یان بەجۆرێک نەبێت لەلای هاوەڵانی رسول الله جیاوازی هەستپێبکرێت، یان تێڕوانینبکرێت بە موتەفەق بونن لە گەڵ حوکم، یان ئیتفاق هەبێ لە هێنانی هەردوو شەیخەکانی موسلیم و بخاری...)[تدريب الراوي في شرح تقريب النووي للسيوطي:٢/٢٠٢] جا دەچینە سەری ان شاءالله لەوەی ئایا ئەم سێ بەشە کامەیانلە گەڵ شەڕح موتەفقن زیاتر وە کامەیان پێچەوانەیە و کامەیان لای هاوەڵان پێچەوانە نیە، بەڵام ئەوەی ئێستابۆمان ڕوون بویەوە ئەوەیە ئیتفاقی یەکێ لەدوو شێخەکەی لەسەر هەیە موسلمکەوا بەشی یەکەم بوو کە بەو شێوەیە هێناویەتی کە دەربڕینی ووشەی{نعم}بەر لە هاتنی{قال}ـە کەوا ئەمەشیان ڕوونە مانای وا دەدات تەواوکەری ووتەکەی عائیشە بووە{رضي الله عنه}

جا کە زانیمان گێڕانەوەی موسلیم پەسندترە لەگێڕانەوەکانی نەسائی و احمد، جا بزانین زانایان چۆن ڕاڤەی ئەم فەرمودانەیان کردوە

١-ئیمامی نەوەوی لە شەڕحی موسلیم ـدا [٧/٤٤]دەڵێت:( ووتی:هەرچەندە خەڵکی نهێنیەکانیان بشارنەوە و الله تعالی ئاگەی لێیەتی بەڵێ، جا ئەمەلە بنچینە دایە ئەمە درووستە، کاتێ کە ووتی هەرچەندە خەڵکی نهێنیەکان بشارنەوە الله تعالی ئاگاداریەتی ئەوە خودی نەفسی خۆی بەڕاست داناوە، ووتی:بەڵێ)

٢-ئیمامی ئەبو عبدالله ـی مالکی لە قاضی عیاض نەقڵ دەکات لەشەڕحەکەی، پشت بە هەمان ووتەی ئیمامی نەوەوی دەبەستێت و دەڵێت:(ووتی:هەرچەندە خەڵکی نهێنیەکانیان

بشارنەوە و الله تعالى ئاگەی لێیەتی بەڵێ، جا ئەمەلە بنچینە دایە ئەمە درووستە، کاتێ کە ووتی هەرچەندە خەڵکی نهێنیەکان بشارنەوە الله تعالى ئاگاداریەتی ئەوە خودی نەفسی خۆی بەڕاست داناوە، ووتی:بەڵێ)[مکمل إکمال المعلم ١٠٣/٣]

٣-ئیمام ابو عبدالله محمد یوسفی حوسیەینی شافعی شەڕحی موسلیم دا دەڵێت:(ووتی:هەرچەندە خەڵکی نهێنیەکانیان بشارنەوە و الله تعالى ئاگەی لێیەتی...، جا ئەمەلە هەموو بنچینەیەک دایە ئەمە درووستە، کاتێ کە ووتی هەرچەندە خەڵکی نهێنیەکان بشارنەوە الله تعالى ئاگاداریەتی ئەوە خودی نەفسی خۆی بەڕاست داناوە، ووتی:بەڵێ)[مکمل إکمال المعلم ١٠٣/٣]

٤-علی سلیمان مغریبی دەڵێت:(ـ{نعم} لەتەواوکەری ووتەی عائیشە بووە وە نەفسی خۆی بەڕاست داناوە)[وشي دیباج في شرح المسلم بن حجاج ١٠٣/١]

٥-شیخ حبیب الرحمن لە پێداچونەوەی موصنەفی عبدالرزاق دەربارەی ئەم فەرمودەیەی عائیشەدەڵێت:(ئەوەی کە ووتی پاشان قسەکەی و نەفسی بەڕاست دانا ووتی: بەڵێ، نەوەویش وای ووتوە)[٣/٥٧١]

٦-محمد ناصرالدین البانی دەربارەی ئەم ووتەیە دەڵێت:(ئەمە لە بنچینە دایە و ئەمە درووستە وە کە ووتی هەرچەندە خەڵکی شتەکان بشارنەوە الله تعالى دەیزانێ ئەوە نەفسی خۆی بەڕاست دانا لەووتەکەی و ووتی:بەڵێ)[مختصر صحیح المسلم للمنذري ١/١٣٤]

با زیاتر درێژی نەکەینەوەووتەی زیاتری زانایانی لەسەرە لە ڕاڤەی ئەم فەرمودەیەکەوا دان بەوە دا دەنێن کە ئەم ووتەیەی{نعم} لەتەواو کەری ووتەی عائیشە بووە، واتا نەفسی خۆی بە ڕاست داناوەتەوە، کەوا لێرەدا ئەوانەی دەڵێن دایکە عائیشە گومانی لە زانستی الله هەبووە وەڵامی خۆیان وەرگرت بەڵام ئاوا جێیان ناهێڵین وەڵامەکەی بە تێروتەسەلی دەدەینەوە لە گشت ڕوێک بۆ ئەوەی ئەم گومانە ڕوون بێت لەلای گشت کەسێ و هیچ مەجالی پارێزگاری کردنی ووتەی ئەو گومانەیان نەبێتن

جا دەچینە سەر ئەو ووتەیەیان کە دەڵێن دایکە عائیشە{رضي الله عنه} نەزان بووە.!!

١- بوخاری هێناویەتی لە رسول الله ـوە صلی الله علیە وسلم بە یەکێ لە خێزانەکانی دەڵێت:(ئازاری عائیشە مەدەن، بەڕاستی وەحی بۆمنناییێ گەر لە بەرگی هەر یەکێکبم تەنها عائیشە نەبێ)

٢-وە لە هەردوو صحیحەکەدا هاتووە لە فەرمودەی ئەنەس، رسول الله دەفەرموێت:(پلەی عائیشە بەسەر پلەی ئافرەتانی تر، وەک و

٣-ئەبو موسای ئەشعەری دەڵێت:(هەریەکێکمان لە هاوڵانی محمد صلی الله علیە وسلم کێشەیەکمانهەبا لە تەنها فەرمودەیەک، ئەوە پرسیارمان لە عائیشە دەکرد ئیللا علمان لێی دەست دەکەوت)

٤-ئیمامی زوهری دەڵێت:(ئەگەر علمی عائیشە لەگەڵ علمی  هەموو ئافرەتان پێورە بکەی ئەوە علمی عائیشە زیاترە)

٥-ذهبی دەڵێت:(هیچ کەسێک لای پێغەمبەر ئەوەندەی عائیشە خۆشەویست نەبوو، وە هیچ کەسێک زانا نەبوو بە ئومەتی محمد صلی الله علیە وسلم جگە لەو، بەڵکو لەنێو ئافرەتاندا بە گشتی کەسێ نەبوو ئەوەندە ئەو بزانێ)[سیر الاعلام نبلاء ١٤٠/٢]

٦-عطاءـی کوری ابی رباح دەڵێت:( عائیشە تێگەیشتوو ترین و زاناترین کەس بوو، وە چاکترین کەس بوو خەڵکی بیبینایە بۆ علم)[سیر الاعلا نبلاء للذهبي ٢٠٠/٢]

ووتە دەربارە و وەسفی دایکە عائیشە زۆرە لە عالمیەکەی، کەوا ئینکاری لێناکرێ، وە هەرکەسێکی عاقڵ ئەگەر هیچ دەربارەی دایکە عائیشە نەزانی ئەوەندە بزانێ ٩ ساڵ لای ئەبو بەکر بوە وە ٩ساڵیش لای پێغەمبەر جا چاوەڕێ دەکەن نەزان بێت؟! تایبەت لە بابەت و مەسائیلێکی وا

جا ڕوونە کەوا لەلای ئەهلی علم بەشی یەکەم گێڕانەوەی فەرمودە وەرگیراوە و ڕاستترە وەک لەوانەی تر کەوا هیچ گومانێک لە خۆی هەڵناگرێت، بەڵکو دایکە عائیشە لە دان نان و زانینەکەیەتی لە علمی الله دەڵێ هەرکاتێ خەڵک شتێ بشارنەوە الله تعالی پێی دەزانی وە

پاشان ووتەی خۆشی بەڕاست دادەنێتەوە دەڵێت بەڵێ، هەروەک و کۆدەنگی ئەهلی علم لە ڕاڤەی فەرمودەکەی موسلیم ـمان زانی

جا ڕەنگە هەندێ دڵ نەخۆش پاش ئەم ڕوون بونەوەشی هەر ئینکاری لێ بکا و بڵێ نا بەشەکانی تر لە گێڕانەوەکەیدا وەردەگرم، جا گەر سەیرێکی بەشی دووەم بکەین دەربڕینی ووتەی{قال}بەر لە{نعم}ـهاتووە، جا گەر کەسێک کەمێک ژیری هەبێ لە عەقڵیدا ئەوە دەزانێ و تێدەگات لێرەشدا بە هیچ شێوەیەک مانای وانادات کەوا دایکە عائیشە نەزان بێت و پرسیاری کردبێ و گومانی هەبوبێ، لەبەر ئەوەی دایکە عائیشە فەرمووی:(هەرچەندە خەڵکی نهێنیەکانیان بشارنەوە و الله تعالی ئاگەی لێیەتی) جا لەبەشی یەکەم خۆی ووتەی خۆی بەڕاست دانایەوە، لەبەشی دووەم ئەم جارە کە دایکە عائیشە خۆی ووتەکەی خۆی جێگیر کرد رسول الله پێی فەرموو: بەڵێ واتا هیچ گومانێ لەخۆی هەڵناگرێ رسول الله ـش دانی بە ووتەکەی ئەودا دانا و فەرمووی بەڵێ، پاشان بەشی سێیەمیش کەوا دەربڕینی ووتەی{نعم} تێدا نەهاتوە کەوا ئەمەشیان بەهەمان شێوە کە دایکە عائیشە ووتەکەی جێگیر کرد(هەرچەندە خەڵکی نهێنیەکانیان بشارنەوە و الله تعالی ئاگەی لێیەتی) پاشان رسول الله لە قسەکانی چوە سەر بابەتێکی تر و گێڕانەوەی بەسەرهاتی ئەو کاتی بۆی لە گەڵ جوبرێلدا

جا دڵ نەخۆشەکان هەندێکیان دەڵێن عائیشە بە شێوەی پرسیار وای ووتوە، کەوا ئەمەشیان هەڵە تێگەیشتنە لە زمانی عربی و ماناکەی، وە پاشان لەگەڵ ئەوەی ئەم بۆچونە پوچەڵە و بێبنەمایە جا پرسیارێک ئاڕاستەی گشت ئەوانە دەکەم کەوا دەڵێن، پێیان دەڵێین کەسەک پرسیارێکت لێ بکات بڵێ یان پرسیار لەکەسێک بکات بڵێ ئایا الله تعالی زانایە بەو شتەی بەندەکان دەیشارنەوە؟ تۆش دەڵێی: بەڵێ و بۆی ڕوون دەکەیەوە؟ یان دەڵێی تۆ کافر بوی ئەوە گومانت لەوە هەیە موشریکی کافری؟؟ ئەوەندە ووتەم بۆ ئەوان جێدێڵم فکر لەم پرسیارە بکەنەوە و عەقڵیان بخەنە کار

پاشان ئەگەر عائیشە گومانی هەبوبێ بە بۆچونی ئەوان، بۆچی رسول الله ڕێگری لێ نەکرد؟ لەو بۆچونەی.! هەروەکو زاندراوە کەوا رسول الله هەڵەی لە هەرکەسێک ببینایە ڕێگری لێ دەکرد وەک و واجبی سەرگشت موسڵمانان فەرمان کردن بەچاکە و ڕێگری لەخەراپە، جا

بۆچی ڕێگری لێ نەکرد؟ نمونە وەک و ئەو فەرمودەی باسمان کرد کەوا ئێوە دوبارە دەیکەنە بەڵگە بۆ عوزر بەجەهل بەگومانتان فەرمودەی ذات انواط..!!

پاشان ئەگەر کەسێک وورد ببێتەوە لەم بەسەرهاتە کەوا بەدرێژی دامان نا بۆ ئەوەی زیاتر ڕون بێ لاتان، بەر لەوەی دایکە عائیشە ئەم قسەیە بکات، بگەڕێنەوە بۆ گفتو گۆی نێوانیان:((ئەوە چیتە عائیشە وا هەناسە بڕکێتە) منیش ووتم:هیچ نییە، فەرموی:(یان پێم دەڵێی یان زاتی لطیف و ئاگا پێم دەڵێت)منیش ووتم ئەی رسول الله ئەی خۆشەویستتر لەباوک و دایکم ئیتر هەموو شتێکم بۆ گێڕایەوە)) جا گەر لێی وورد ببینەوە دەبینین کەدایکە عائیشە وویستویەتی ئەوکارەی بشارێتەوە و ووتەکانی، رسول الله پێی دەفەرموێ:یان پێم دەڵێی یان زاتی لطیف و ئاگا پێم دەڵێت، جا دایکە عائیشەش بێ دوودڵی پێی دەڵێ، خۆ ئەگەر گومانی لە زانینی الله تعالی هەبویە و یی وابوایە الله تعالی نازانێ دەربارەی ئەوەی دەیشارنەوە والعیاذ بالله- چۆن بۆ پێغەمبەری ئاشکرا دەکرد؟ وەڵام؟ وە پاشان رسول الله ئەو کاتیش پێی ووت دەیڵێی یان الله تعالی خۆی پێم دەڵێ واتا رسول الله جگە لەوەی پێشتر ڕونیکردوە لای ئەمجاریش زانینی الله جێگیر کردو جەختی لەسەرکردەوە لای عائیشە، جا عائیشە چۆن دەڵێن نەزان بووە؟ وە چۆن دەڵێن گومانی هەبوە؟.-

جا سەرەتا بەبەڵگە وەڵامی ئەم گومانانەمان دایەوە بە گشتی وە پاشان گەر بە عەقڵیش وەڵامی ئەوانەماندایەوە کەوا دەرکەوت ئەوانەی ئەم ووتەیە دەهێننەوە هەم لە نەقڵەکەیان هەڵەیان کردوە و وەهەم لە بیرکردنەوەی عەقڵیان

## گومانی دوازدە: ئەو کۆتا خەڵکەی لە ئاگر دەردەچن و هیچ خێرێکیان نەکردوە

لە ئەبی سەعیدی خودریەوە{رضي الله عنە} دەڵێت: رسول الله صلى الله عليه وسلم دەڵێت:(کاتێک لەڕۆژی دوایدا ئیمانداران کۆتایی لەناو ئاگردا ئیمانیان هەبوو، جا یەکەتان گفتوگۆ دەکەن لەبارەی هاوەڵەکانتان لەسەر حەق لەوەی لەدونیابو، بەتوندترین گفتوگۆوە، لەو ئیماندارانەی بۆ پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە بۆ ئەو برایانەیان کەوا براونەتە نێو ئاگر) دەڵێێن:(ئەی پەروەردگارا براکانمان لە نوێژکەران بون لەگەڵمان، وە ڕووژیان دەگرت لەگەڵمان،

وه حەجیان دەکرد لەگەڵمانا ئایە دەیانبەنە ئاگر) دەڵێت:(دەریان بێنن لەوەی ناسیوتانە). ........ دەڵێن:(توندتر- خەڵکانێک هیچ،خێرێکی بۆ الله نەکردوە دەیسوتێنێ تا دەبێتە ئاگراوێک) ..._جا الله تعالی بەوانە دەڵێت:( بڕۆنە ناو بەهەشت چ ئاواتێک دەخوازن یان چی دەبینن لە شتێ ئەوە بۆ ئێوەیە لەلای من زیاتریش هەیە) دەڵێن:(ئەی پەروەردگارم لەمە زیاتر چییە؟) دەڵێت:(ڕەزامەندی من بۆ ئێوە)[رواه احمد ۳۹۵/۸]

لەم فەرموده پیرۆزەشدا، ئەوانەی عوزر بۆ کافر و موشریکان دێننەوە ئەم فەرمودەیە بۆخۆیان دەکەن بە بەڵگە دەڵێن: سەیرکەن کابرا هیچ خێرێکی نەکردوە و الله تعالی لێی خۆشبوو پێی ووتن بڕۆنە بەهەشت بە هەرچی دەیبینن و ئاواتی بۆ دەخوازن هی ئێوەیە، جا کابرا عوزری هەبوە نەزان بوە یا... عوزری پێ درایە و خراوەتە بەهەشت..!!!

دەربڕینی(لم یعملوا لله خیرا قط) هیچ خێرێکی نەکردبوو، ئایا پێیان وایە ئەم کەسانە کافر و موشریک بونە و هیچ خێرێکی تەوحیدیان نەبوە و عوزریشیان پێ دراوە و خراونەتە بەهشەت؟.! پەنادەگرین بە رب العالمین لەم لێکدانەوە خەراپ و باطڵە،

(لم یعملوا لله خیرا قط) واتا:هیچ خێرێکی نەبوە و نەیکردوە جگە لە تەوحید نەبێ، لە زمانی عرەبی دا وا بەکار دێ مانای وانیە کەسەکە هیچ خێرێکی نەکردبێ بەڵکو کردویەتی بەڵام کەمی کردووە، جا لەبەر ئەوەش هیچ کەسێک ناچێتە بەهەشت مەگەر کەسەکە خاوەنی توحید بێت نەوەک خاوەنی شیرک و کوفر بێت، هەر وەک و الله تعالی دەفەرموێت : **(إِنَّهُ مَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ)[المائدة/٧٢]** واتە: بەڕاستی ئەوەی شیرک بۆ الله دابنێت، ئەوا بەدڵنیاییەوە الله تعالی بەهەشتی لەسەر حەڕام دەکات، شوێن و مانەوەشی ناو ئاگرە و هیچ پشتیوانێک ستەمکارەان نییە.، وەدەفەرموێت : **(إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَالْمُشْرِكِينَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَ)[البينة/٦]** واتە: بەڕاستی ئەو کافرانەی لە خاوەنانی کتێب و موشریکان لەناو ئاگری جەهەنەم دان و بەنەمری تێیدا دەمێننەوە.، وەدەفەرموێت : **(إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَاءُ)[النساء/٤٨]** واتە: بەڕاستی الله تعالی لە کەسێ خۆشنابێت کە شیرکی ئەنجام دابێ،

بەڵکو لەجگە لەوە خۆشدەبێت بەویستی خۆی.، جا بەڕاستی هەرکەسێ بڵێت ئەوانە کەوتونەتە نێو کوفر و شیرک الله تعالی لێیان خۆش بووە ئەوە بەڕاستی کوفری کردووە و وەعد و بەڵگە و هەواڵی الله تعالی ـیبەدرۆ خستۆتەوە والعیاذ بالله، هەرکەسێ بکەوێتە ناو کوفر و لەسەر ئەمە مردبێ ئیللا لە هاوەڵانی جەهەنەمە و بەهەشتی لەسەر حەڕامکراوە، وە ووتەی رسول الله صلی الله علیه وسلم کە فەرمووی:(لم یعملوا لله خیرا قط) واتای وانییە کە هیچ خێرێکی نەکردبێ، بەڵکو وەک و ئەو فەرمودەیەی باسیشمان لێوە کرد ئەوپیاوەی ووتی بمسوتێنن کە رسول الله دەربارەی دەفەرموێ هەر لەسەرەتا دەڵێت،بەهەمان شێوە لە موسنەدی ئیمامی احمد هاتووە دەڵێت(لم یعمل خیرا قط إلا توحید) هیچ خێرێکی نەکردبوو تەنها تەوحید نەبێ، ئەمەش بەهەمان شێوەیە کەسەکە هیچ خێرێکی نەبووە جگە لەتەوحید، یا کە رسول الله صلی الله علیه وسلم دەربارەی سیفاتی ئافرەتان دەڵێت ئافرەتان عادەتیان وایە پیاوەکەی یەک ساڵ چاکەی لەگەڵ بکات، بەڵام دوای ئەوە یەک خەراپەی لەگەڵ بکات ئەوەدەڵێت:(ما رأیت منک خیرا قط)واتە: هەرگیز خێرم لەتۆ نەبینیوە، ئایا پیاوەکەی هیچ خێرێکی نەکردبوو؟ بەڵێ کردبوی بەڵام ئەم دەربڕینە لێکدانەوەی پێویستە هەروا بە ڕوی ئاشکرای وەرناگیرێت وە لە ماناو لێکدانەوەی ئەمـ(لم یعملوا لله خیرا قط)ـە هیچ یەکێک لەم ئوممەتە جیاواز نیە تێیدا و هیچ جیاوازیەک نادۆزیەوە لە نێوان ئەهلی علم،وە ئەم دەربڕینەش ڕوونە لە نێو زمانی عەرەبیدا کەوا مانای وانییە کەسەکە هیچی نەکردبێ نەخێر بەڵام مانای کەمتەرخەمی و نەقصێکە لە کارەکانیدا، هەروەک و ئیمامی ئیبن خزیمە{رحمه الله} دەڵێت:( ئەم دەربڕینە(لم یعملوا لله خیرا قط) لە خودی ووتەی عەڕەبە، نەفی ناوی شتێک دەکات لەبەر کەموکوڕتی لە تەواویەکەی، وە مانای ئەم ووتەیە لە سەر بنچینەکەی بریتیە: هیچ خێرێکی نەکردبوو لەسەر تەواویەتیەکەی، نەوەک لەسەر ئەوەی واجب کرابوو لەسەری و فەرمانی پێکرابوو، هەروەک و ئەم مانایەم لەزۆر بابەتەکانی کتێبەکەمدا ڕوون کردۆتەوە)[توحید ٧٣٢/٢] وە ئەوانەی کە نوێژ و ڕۆژو و حەجیان کردوە لە گەڵ موسڵمانان هەر خاوەنی تەوحید بوونە بەڵام بەهۆی سەرپێچی و تاوانەکانیانەوە بووە وە کە داواکراوە لە

الله تعالى بە فەزڵی خۆی لێیان خۆشبووە، وە ئەوانەشی کەوا هیچ خێرێکیان نەکردبوو جگە لە تەوحیدەکەیان نەبێ بەهەمان شێوە الله تعالى بە فەزڵی خۆی لە موەحیدەکان خۆش بوو، بابەتێکە هیچ پەیوەندی بە کوفر و تەکفیر و عوزر نییە، بەڵکو باسی موسڵمانانە و ئەوانەنە کەوا الله تعالى بە فەزڵی خۆی لێیان خۆش دەبێت بەهۆی تەوحیدەکەیان

## گومانی سێزدە : سوجدەی معاذ{رضي الله عنه}

لە عبدالله ـی کوڕی ئەوف دەڵێت: لەو کاتەی مەعاذ لەشام گەڕایەوە سوجدەی بۆ رسول الله برد، رسول الله فەرموی: ئەمە چیە ئەی مەعاذ؟ ووتی: چووم بۆ شام بینیم سوجدەیان بۆ پیاوە ئاینیەکان و سەرۆکەکانیان دەبرد، جا لەنەفسم تۆی بەشایستە زانی بۆت بکەم، رسول الله صلى الله عليه وسلم فەرمووی: وامەکە بەڕاستی ئەگەر فەرمانم بکردایە کەوا سوجدە بۆ جگە لە الله ببردرابایە ئەوە فەرمانم دەکرد ئافرەتەکان سوجدە بۆ مێردەکانیان ببەن.،

وە لە گێڕانەوەکانی ابوداود[٢١٤٠] وە حاکم[٢٧٦٣] هێناویانە، کەوا مەعاذ سوجدەی بۆ رسول الله نەبردوە تەنها پرسیاری لێکردوە و داوای ڕوخسەتی لێ کردوە رسول الله صلى الله عليه وسلم ئینکاری لێ کردووە

جا ئەهلی گومان لەم فەرمودەیەش دا دەڵێن سەیری کەن سوجدەی بۆ رسول الله بردوە و رسول الله بەکافری دانەنایە و عوزری بۆ هێنایەتەوە نەزان بووە..!!

دوو جۆر سوجدەمان هەیە

سوجدەیەک بۆ جێبەجێ کردنی حەقی بەندایەتی و پەرستنەکانە بۆ پەروەردگار کەوا ئەمە تایبەتە بە الله تعالى و هەرکەسێ بۆ غەیریە الله سوجدەی پەرستن و بەندایەتی کردن بیا ئەوە کافرە و هیچ عوزرێکی بۆ نیە

وە سوجدەی ڕێزگرتن کەوا ئەم جۆرە سوجدەیە ڕێگە پێدراوبوو تا لەشەریعەتی ئیسلام نەسخ کراو حەڕام کرا و نەهێڵدرا، وەک و فەرمانکردنی الله تعالى بە سوجدە بردن بۆ ئادەم عليه

سلام، سوجدەی ڕێز بوو وە پێغەمبەر یوسف علیه السلام بەهەمان شێوە ئیبن کەثیر{رحمه الله} لە تەفسیری ووتەی الله تعالی دا(**وَخَرُّوا لَهُ سُجَّدًا)[یوسف/١٠٠]** دەڵێت:( ئەمە لە شەریعەتی ئەواندا دەیخوارد، ئەگەر پێشوازیان لە گەورەکانیان بکردایە سوجدەیان بۆ دەبردن، وە ئەمەش هەر ڕێگە پێدراو جائیز بوو لە ئادەمەوە تا وەک و شەریعەتی عیسا علیه السلام، لەم میللەتە حەڕام کرا و سوجدە تایبەت کرا بە الله سبحان وتعالی، وە ئەمەش ووتەی قەتادە و جگە لەوانیشە)[تفسیر ابن الكثير ٤١٢/٤]

---

وە قرطبی دەڵێت: (وەلەلای زۆرینەیان ئەمە ڕێگەپێدراو بوو تا سەردەمی رسول الله صلی الله علیه وسلم  کاتێ هاوەڵانی پێیان ووت)[القرطبي ٢٩٣/١]

وە ئەگەر لەم فەرمودەیە وورد ببینەوە دەبینین مەعاذ فەرمووی بینیم سوجدەیان بۆ سەرۆک و پیاوە ئاینیەکانیان دەبرد بۆیە تۆم بە شایستە تر زانی، ئەوان سوجدەیان بۆ دەبردن وەک و ڕێزێک بۆ ئەم طاغوتانە مەعاذ رسول الله ـی بە شایستەتر و لەپێشتر بینی بۆ ئەم کارە، وە ئەگەرسەرنج بدەینە ووتەی رسول الله صلی الله علیه وسلم کە دەفەرموێ: ئەگەر ڕێگەدرابا سوجدە ببردرابایە ئەو ەڕێگام دەدا ئافرەت بۆ مێردەکەی سوجدە ببا، ئایا واتای وایە ئافرەت مێردەکەی بپەرستێت؟ نەخێر سوجدەی ڕێزە و ڕێزگرتنە

جا ئەمە هیچ کوفریەکی تێدا نیە و حەڕام کراوە و شتێ بووە لە سەردەمانی پێشتر ڕێگە پێدراو بوە وە لە شەریعەتی رسول الله نەسخ کراوەتەوە

وە ئەم فەرمودەیەش لەڕووی مەتن و سەنەدەوە ضعیفە، وە لەفەرمودەکە دەڵێ مەعاذ چوو بۆ شام، بەڵام معاذ لەتەمەنی پێغەمبەردا نەچووە بۆشام بەڵکو چوە بۆ یەمەن، وە لە پاش وەفاتی رسول الله صلی الله علیه وسلم شام فەتح کرا، جا گەر لە ڕوی مەتن و سەنەدیشەو صحیح بێ ئەوە هیچ گومانێ لەخۆی هەڵناگرێ سوجدەی ڕێز بوە کارەکەیکوفر نەبوە وتاوەک و عوزری بۆ بهێندرێتەوە وە لە ڕیوایەتەکانی ابن ماجە و حاکم سوجدەی نەبردوە بەڵکو تەنها پرسیاری کردوە، جا هەرچۆن بێ بەهیچ شێوەیەک نابێتە بەڵگە بۆ بابەتی عوزر بۆ نەزان و هیچ گومانێک لەخۆی هەڵناگرێت و فەرمودەکە و مەبەستەکەی ڕوونە ولله الحمد والمنه.

## گومانی چواردە: گەلی موسا

الله تعالی دەفەرموێت: **(وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ يَا قَوْمِ إِنَّكُمْ ظَلَمْتُمْ أَنفُسَكُم بِاتِّخَاذِكُمُ الْعِجْلَ فَتُوبُوا إِلَىٰ بَارِئِكُمْ فَاقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ عِندَ بَارِئِكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ ۚ إِنَّهُ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ)[البقرة/٥٤]**

واتە:کاتێک موسا بەگەلەکەی خۆی گووت: ئەی گەلەکەم ئێوە ستەمتان لە نەفسی خۆتان کرد بەو گوێرەکە پەرستیەتان، جا داوای لێبوردن لە پەروەردگارتان بکەن و بۆ ئێوە وا چاکترە خۆتان بکوژن بەڕاستی الله تعالی ئەو پەروەردگارەیە کە لێبوردە و خاوەن بەزەییە.،

دڵ نەخۆشەکان لەم ئایەتە پیرۆز و پڕ مانایە و ڕوونەدا گومانی خۆیان تێخست و دەڵێن: سەیریکەن ئەوانە شیریکیان کرد پێغەمبەر موسا نەیووت کافرن یان موشریکن تەنها پێی ووتن ستەمتان لە نەفسی خۆتان کرد..!! سبحان الله

لەلای ئەمانە ستەم: واتا عوزر.!! ئایا ستەمیان لە چی دابوو ئەوانە ستەمی چیان کردبوو؟، ئەوانە کەوتنە ناو کوفر و ڕیددە جا بەم شیرک ئەنجام دانەیان ستەمیان لە نەفسی خۆیان کرد کەوا الله تعالی ئەم نەفسەی لە ڕۆژی دوایدا سزادەدا بە توندترین سزاوە ستەمیان لە خۆیان کرد، جا دەچینە سەر بەڵگەکان لە قورئان دا بزانین ئایا ستەم بە چ مانایەک دێت:

١- الله تعالی دەفەرموێت:(إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيم)[لقمان/١٣] واتە: بەڕاستی شیرک ئەنجام دان ستەمێکی گەورەیە.، الله تعالی وەسفی شیرکی کرد بە زوڵم، وەک و چۆن لەسەروە وەسفی موشریکی کرد بەستەمکار

٢-الله تعالی دەفەرموێت : **(أَلَا لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ)[هود/١٨]** واتە: جا بەڕاستی نەفرینی لە الله تعالی لەسەر ستەمکارانە.،

نەفرینی الله تعالی لەسەر کافرانە جا ستەمیش هەر لەو کافرانەیە

٣-الله تعالی دەفەرموێت : **(فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَبَ عَلَى اللَّهِ)[الزمر/٣٢]** واتە: چ کەسێک لەوە ستەمکارترە کەوا درۆ بۆ الله تعالی هەڵبەستێ؟.،

٤-الله تعالى دەفەرموێت : (وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِبًا)[الأنعام/٩٣] واتە: کێ لەوکەسە ستەمکارترە کەوا قسە بۆ الله تعالی هەڵدەبەستێ بەدرۆ؟..

٥- الله تعالى دەفەرموێت : (وَالْكَافِرُونَ هُمُ الظَّالِمُونَ)[البقرة/٢٥٤] واتە: وە کافران هەر لە ستەمکارانن.،

کافران هەر لە ستەمکارانن جاڕوونە و هیچ گومانێک لە خۆی هەڵناگرێت، بەڵکو ئەوپەڕی نەزانینە ستەم بە عوزر تێبگەیشترێ- الله تعالی پەنامان دات-

ابن جرير لە تەفسیری ئەم ئایەتە دا دەڵێت:( هەروەک و الله تعالی هەواڵی پێداوین: بە هەڵگەڕانەوەیان بە پەرستنی گوێرەکە بە پەروەردگاریان لە پاش جیابونەوەیانلە موسا، پاشان موسا فەرمانی پێ کردن بە پێداچونەوەی تاوانەکەیان، وە گەڕانەوەیان بۆ لا الله تعالی لە هەڵگەڕانەوەکەیان، بە تەوبە کردن، وە ملکەچ بوون بۆ گوێڕایەڵی کردنی ئەوەی فەرمانیان پێ کراوە، وە هەواڵیان پێ درا تەوبەکەیان لەو تاوانەی کەوا کەتبونە نێوی کوشتنی نەفسی خۆیانە)

جا ئەوانە لەپاش ئەوەی پێغەمبەریان بۆ هات و ئیمانیان هێنا هەڵگەڕانەوە و چونە سەر گوێرەکە پەرستی و شیرک و کافر بوون جا موسا علیه السلام فەرمانی پێ کردن بگەڕێنەوە بۆ تەوحید و داوای لێ خۆش بوون لەالله تعالی بکەن، جا الله تعالی ئەمری کرد بۆ قەبوڵ بونی تەوبە خۆیان بکوژن جا موسا فەرمانی پێکردن ئەوەبوو حەفتا هەزار کەسیان کوژران، جا بە پێچەوانەوە هیچ عوزرێکیان پێ نەدرا بەڵکو ڕاستەوخۆ ناو و حوکمی کوفری بەسەردا جێگیرکردن.

### گومانی یازدە: ووتەکانی شێخەکانی ئیسلام{إبن تيمية} و {محمد بن عبدالوهاب}

لە پێـش دا ووتەکانی شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە ـەان دانا، وە هەروەها شێخی نوێکەرەوەی ئیسلام محمدی کوڕی عبدالوهاب ڕەحمـەتی الله تعالی ـیان لێبـێت، جا ئەم ووتانەی دامان نان بنچینە و تێگەیشتن و بیروباوەڕی هەردوو شێخەکە بوون، بەڵام ئەوانەی عوزر بۆ کافر و

موشریکان دێننەوە لەپاش ئەوەی گومانەکانیان لە قورئان و سوننـەت نامێنێ و نایانبێت دێن تۆمەت و بوختان بۆ بیـروبـاوەڕی ئەم دوو شێخە دەکەن و ووتەکانیان پێش و پاش و تێگەیشتنەکەی لێی دەبڕن و دای دەنێن و ئینجـا بۆ خۆیـان لێکدانـەوەی بۆ دەکـەن و دەیکەنە بەڵگـە و دێن و دەیهێـنن نیشانی موەحیدانی دەدەن دەڵێن ئەوتا ووتەکانیـان ئێوە پێچەوانەی ئەوانن..!!

لە گەڵ ئەوەی بێ ئاگان لە ووتەکانیان لە بیروباوەڕەکەیان کەوا نمونـەیی بـونە لە نێو زاناکان لە نەفی عوزر بۆ جاهیـل و وەڵامدانـەوەیان بۆ ئەوانـەی عوزر بۆ جاهیل دێنـنەوە لە کوفر و شیرکدا، گومانەکان هەر تەنها لەسەر ئەم دو شێخە نیە زیاترە بەڵام زیاتر جەخت دەخەینە سەر ئەمانە، ان شاءالله تعالی لە دوو خاڵدا ئەو هەڵە تێگەیشتنەی لە ووتەکانیان کەوا دەکا بە خوێنەرێکی شارەزا نەبوو لەبیروباواڕ و وتەکانیان پێچەوانە تێبگات لە ووتەکانیان، ئەمەش بەهۆی شارەزا نەبون بە بیروباوەڕ و ڕێکخستنەکانی بیروباوەڕیان، جا لەم دوو خاڵە مەبەستی هەردوو زانا و زاناکانی تر دەخەینە ڕوو:

یەکەم: لە هەندێ مەسائیل دا دەڵێن خاوەنەکەی حومی کوفری بەسەرا نادەین تا وەک و ئیقامە حوجە دەکرێت، جا زۆرێک لە مەبەست و مانای ئەم ئیقامە حوجەیە تێنەگەیشتون و نازانن مەرج بۆ ئیقامە حوجە و بڕینی عوزر بۆ کەسەکان لە لای زاناکان چۆنە، لە بەشی ووتەکانیان دامان نان بەڵام پێم باشبوو لێرەدا بەجیاواز باسیان لێوە بکەین و دەربارەی ناکۆکیەکان لەسەرووتەکەی بدوێین، ئەوانەی لە ووتەی شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە و محمدی کوڕی عبدالوهاب تێنەگەیشتوون لە ئیقامە حوجە ـدا، جا شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب هەم بیروباوەڕی خۆی و هەمیش ئیبن تەیمیە ڕوون دەکاتەوە بۆ ئەوانەی پرسیاری لێ دەکەن و گومانیان لەسەر ووتەکانی ئیبن تەیمیە درووست کردوە و دەڵێت:( ئەوەی باست کرد لە ووتەی شێخ{مەبەست ابن تیمیە}، هەر کەسێ پێداگری شتێ بکا ئاوا و ئاوا، وە حوجەشی پێ گەشتبێ، وە ئێوەش گومانتان هەبێ لەو تاغوطانە و شوێنکەوتوانیان، ئایا حوجەیان پێ گەیشتوە! ئائەمەلە سەیروسەمەرەکاندایە، چۆن گومانتان هەیە لەوەدا لە کاتێکدا چەندین جار

ڕونم کردۆتەوە بۆتان؟!، ئەو کەسەی حوجەی پێ نەگەیشتوە بریتیە لەو کەسەی تازە موسڵمان بوە، یان کەسێ لە وڵاتێک و شوێنێکی دوور بژی لە موسڵمانان، یا لە مەسائیلە خەفیە کان، نمونە صرف و عطف، بە کافر داناندرێن هەتا نەیزانن، بەڵام ئەو بنچینەی دین کەوا الله ڕوونی کردۆتەوە و موحەکەمی کردوە لە کتێبەکەیدا، کەوا بەڕاستی حوجەی الله بریتیەلە قورئان، جا هەر کەسێ قورئانی پێ گەیشت ئەوە حوجەی پێ گەیشتوە، بەڵام بنچینەی کێشەکە ئەوەیە ئێوە جیاوازی ناکەن لە نێوان{إقامة الحجة}گەیشتنی حوجەکە و{فهم الحجة} تێگەیشتن وزانینی حوجەکە، بەڕاستی زۆرینە کافر و مونافیقان لە موسڵمانان، هەر تێنەگەیشتینە و نەزانن بە حوجەی الله لە گەڵ ئەوەی پێیان گەیشتوە، هەر وەک و الله تعالی دەفەرموێت : **(أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا)[الفرقان/٤٤]**واتە:وای دادەنێن کەوا زۆرینەی ئەوکافران گوێ دەگرن وتێیدەگەن! بەڵکو ئەوانە وەک و ئاژەڵەکانن بەڵکو ئەوان لە ئاژەڵەکان زیاتر ڕێگایان بزر کردوە.، جا گەیشتنی حوجە جۆرێکە و، تێگەیشتنیش لێی جۆرێکی تر، بەڕاستی حوجە گەیشتووە وە تێگەیشتنیش بابەتێکی ترە، وە کافربونیان بە پێ گەیشتنیانەتەنها، وە ئەگەر لێشی تێنەگەن.)[الدرر السنية ج١٠ ص٩٣-٩٤]

جا شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب ڕوونی دەکاتەوە بۆ ئەوانەی لە مەسائیلی حوجە و ووتەکانی شێخ تێنەگەیشتوون، وە باسی ئەو کێشەیە دەکات کەوا کەوتۆتە نێو فێرخوازان و جیاوازی ناکەن لە نێوان پێگەیشتنی حوجە و تێگەیشتنی حوجە، وە ڕوونی کردەوە حوجەی الله تعالی بریتیە لە قورئان هەرکەسێ پێی گەیشت ئەوە ئیقامە حوجە کراوا و هیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوە نامێنێ بۆ عوزر هێنانەوە، جا لە هەرشوێنێک کە باسی ئیقامە حوجەیان کرد مەبەستیان پێی گەیشتنی قورئان و سونەتە بەخاوەنەکەی ئەگەر چی لێشی تێنەگەیشتبێ و تێگەیشتن مەرج نیە لە ئیقامە حوجە دا وە شیخ محمدی کوڕی عبدالوهاب{رحمه الله} دەربارەی ئەو کەسانەی هەڵە لە ووتەکانی شیخ ابن تیمیە تێگەیشتونە، دەڵێت:(وە دەربڕینی شێخی ئیسلامیش ئیبن تەیمیە کەوا بەووەوە خۆتان داپۆشیوە، گشتی لەمە بەهێزتری دەکا، وە ئەگەر ئێمە بڵێین زۆربەی ناودارەکان کافرن بە دیاریکراویان، تێیدا ڕاشکاوە کەوا دیاریکراو{معین} تەکفیر ناکرێت تەنها ئەگەر حوجەی پێ گەیشتبێ، وە زاندراوە کەوا

گەیشتنی حوجە مانای وانییە لە ووتەی الله و رسولەکەی تێگەیشتبێ ،هاوشێوەی ئەبوبکری صدیق، بەڵکو ئەگەر ووتەی الله و رسولەکەی پێ گەیشت و عوزری بۆ خۆشی هێنایەوە، ئەوە کافرە هەروەک و کافران، هەموویان حوجەیان پێگەیشتوەبە قورئان، هەروەک و دەفەرموێت: **(إِنَّا جَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ)[الكهف/٥٧]**)[رسالة تكفير المعين/١١-١٢]

لێرەشدا بەهەمان شێوە ڕوونی کردەوە کەوا مەبەستی ووتەکانی شێخ ئیبن تەیمیە و خۆی لە ئیقامە حوجەدا بریتیە لە گەیشتنی قورئان بەهەرکەسێ، وە ڕوونی کردەوە مانای وانییە لێی تێگەیشتبێت، جا کە دەربارەی شتێک دەدوێن دەڵێن پێویستە ئیقامە حوجە بکرێت ئەوە مەبەستیان گەیشتنی قورئانە بەهەرکەسێک.

دووەم: هەندێک ووتەیان هەیە دەربارەی مەسائیلی خەفیەکان لەنمونەی بەشێک لە بابەتی صیفات و ئیماندا، یان لەمەسائیلی ظاهیری دا بۆ ئەو کەسانەی لەووڵاتێکی دوور لە موسڵمانان دەژین کەوا دەڵێن بەکافریان دا نانێین، لەسەرەتادادوو مەسائیلی زۆر گرینگمان ڕوون کردەوە مەسائیلی اسماء و احکام، جا کە دەڵێن بەکافر داناندرێن مانای وانیە ناوی کوفریان بەسەردا جێگیر نەبوبێ، لەبەر ئەوەی ناوی کوفر و شیرک هەرکەسێ ئەنجامی بدات بەر لەوەی حوجەی پێ بگات و پاش ئەوەی پێشی بگات هەر لەسەری جێگیر دەبێت هەرکەسێ کردی جێگیر دەبێ بەسەری و پێی ناوترێ موسڵمان، بەڵام ئەوەی لەسەری دەوەستێندرێت بریتیە لە حوکمەکەی کەوا خاوەنەکەی حوکمی کوفری بەسەردا نادرێت تا ئەو کاتەی بەڵگەکانی بۆ ڕوون دەکرێتەوە و گومانی دەبڕدرێ ئەمەش بەهۆی شاراوەیی و نەتوانینی کەسەکەیە بۆ فێربونی ئەم زانستە جا گەر لەپاش ئەمە پێداگری کرد ئەوە حوکمی مورتەدیشی بەسەردا دەدرێت و دەکوژرێت، تێکەڵ کردنی ئەم دوو مەسائیلی اسماء و احکام ـە لە مەسائیلی خەفی و ظاهیریدا کێشەدرووست دەکات لە تێگەیشتن بۆ گشت دەقەکانی قورئان و سوننەت و ووتەی زانایان، جا دەچینە سەر ووتەکانیان لە جیاوازی کردنیان لەنێوان ئەم مەسائیلانەدا: ئیبن تەیمیە {رحمە الله}دەڵێت:( بەڕاستی الله تعالى جیاوازی کردووە لە نێوان هاتنی پەیامەکە و پێش هاتنی لە ناو و حوکمەکانیاندا وە کۆیانبکاتەوە لەنێوانیاندا لە ناو و حوکمەکاندا)[مجموع الفتاوى ٢٠/٣٧]

شێخ لێرەدا ئەم جیاوازیە دەخاتە ڕوو لە ناو حوکم ـدا لەوەی پێش پەیامەکەی پێ بگات، وە لەوەی پاش ئەوەی پەیام و حوججەکەی پێ بگات

وە دەڵێت:(ناوی کەسێک جێگیر دەبێ و نکۆڵیدەکرێ بە پێی حوکمەکە پەیوەست دەبێ پێیەوە، بەڵام واجب نابێت لە جێگیر کردن و نکۆڵیکردنی لە حوکم کەوا وەک و حوکمەکانی تربێت)[مجموع الفتاوى ٧/٤١٨]

شێخ لێرەشدا زۆر جوان ڕوونی دەکاتەوە کەوا ناوەکان بە پێی حوکم جێگیر دەبێ، کەوا ئەمەش بریتیە لە مەسائیلە ظاهیریەکان، وە پاشان دەڵێت واجب نابێت لەسەری کەوا هەموو کاتێک وەک و حوکمەکانی تر وابێت، ڕوونە مەبەست پێی مەسائیلی خەفیە کەوا ناوەکەی پەیوەست نابێ بە حوکمەکەی

وە دەڵێت:(هەرکەسێک پێداگری لە واجبە ئاشکرا جەخت لەسەرکراوەکان بکات، یان پێداگری حەڕامەئاشکراکان بکات، وەک و خەراپەکاری و ستەم و مەشڕوب و زینا و ڕیبا، یان پێداگربێ حەڵاڵێتی بەشێ لە ڕێگەپێدراوە ئاشکراکانبکات، وەک و نان و گۆشت و نیکاح، ئەوە کافر و موڕتەدە، تەوبەی پێ دەکرێ یان تەوبەی لێ دەکات یان دەکوژرێ)[مختصر الفتاوى المصرية/٢٤٥]

شێخ لێرەدا لەمەسائیلی ظاهیری دەدوێ و ڕوونی دەکاتەوە ئەوەکەسەی بکەوێتە ناوی ئەوە کافر و موڕتەدە، ناو و حوکمی کوفری بەسەردا جێگیر کردووە جا شێخ عبدالرحمن ـی کوڕی حسنـی کوڕی شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب{رحمه الله} لەبارەی ئەم ووتەی شێخ دەڵێت:( شێخی ئیسلام هیچ عوزرێکی نەهێنایەوە بە نەزانینیان، بەڵکو بەکافری دانان وە ووتی ئەمانە موڕتەد بونەتەوە)[تحقيق مذهب شيخ ابن تيمية.٢٧/]

ئیبن تیمیە{رحمه الله} دەڵێت:(وە ئەمەش ئەگەر لە ووتە شاراوەکان{خفية}ـبوو،کە تێیدا دەڵێین: ئەو کەسە هەڵەکارێکی گومڕایە و حوجەی پێ نەگەیشتووە کەوا خاوەنەکەی کافر بکات)[مجموع الفتاوى ٥٤/٤]

جا شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب دەربارەی ئەم ووتەیەی ئیبن تەیمە ڕونکردنەوە دەدات و دەڵێت:(ئا ئەمە سیفاتی قسەکردنیتی لەو مەسەلەیەدا لە هەموو بابەتێک لەسەر ووتەکانی وەستاوین، وە باسی ئەوە ناکات تەکفیری کەسی دیاری کراو نەکات تەنها ئەگەر کێشەیەکی تێدا هەبێ، وەمەبەست لەوەستان لە تەکفیر کردنی بەر لە پێگەیشتنی، وە ئەگەر پێی گەیشت ئەوە حوکمی ئەو کارەی بەسەرِدا دەدرێت کە هەڵیوەشاندۆتەوە لە هەربابەتێک لە تەکفیردا یان تەفسیق، وە ڕەحمەتی الله ـی لێ بێ وتەکانیشی ڕاشکاون کەوا لە گەڵ جگە لەمەسائیلی ظاهیری ـتی)[الدرر السنة ٩/٤١٨]

## پەیامی کۆتایی

الحمدلله بە فەزڵی الله تعالی توانیم ئەم بابەتە گرینگە و پێیوستە و نامۆیەی نێو موسڵمانان بگەینم، وە بە کورتی و پوختکراوەیی سەرجەم بەش و بابەتەکان، جا کۆتا پەیامم و ئاگادارکردنەوە ئەوەیە: خۆتان شارەزا بکەن لە دینەکەی الله تعالی وە ئاگادار بن و بزانن دینەکەتان لە چ کەسێکەوە وەردەگرن، وە دەست بە قورئان و سوننەتی رسول الله بگرن و پێیەوە پەیوست بن وە پەیوەستی ئەو کۆمەڵەیە بن کەوا دامەزراوە لەسەرقورئان و سوننەت، وە ئاگاداربن و ئاگاداربن لە قسە هەڵبەستن بۆ الله تعالی و رسولەکەی بەوەیبڵێن عوزریان بۆ کەسی نەزان هێناوەتەوە، بەڕاستی گومڕایی و دەرچونە لە میللەت، وە ئاگاداربن و ترستان لەوە هەبێت بکەونە ناو هەرکارێکی کوفر یان شیرک و هەست بەخۆتان نەکەن و نەزان بن پێیەوە، جا ئاگاداری بن و پەیوەست بن بە زانستی شەڕعیەوە، لە مەرجەکانی تەواوێتی و هێنانە دی لاالەالا الله مەرجی سەرەتای زانین و زانستە کەوا واجبە لە سەر گشت کەسێ دەست بە علمەوە بگرێ وە خۆی لە تەوحید و بیروباوەڕێکی ڕاست و درووستی درووست بوو لەسەر قورئان سوننەت شارەزا بکات، هەروەک و رسول الله صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: هەرکەسێ مردبێ و لە لاالەالاالله زانیبێ ئەوە دەچێتە بەهەشت.، جا دەست بە ڕێگا ڕاستەکەی الله تعالی بگرن بە زانست و زانینەوە، بەڕاستی هەر کەسێک توانای هەبێت نەزانین لەسەر خۆی بەرز بکاتەوە بۆ زانین و نەزانی نەهێڵێ و هەوڵبدات بۆ فێربونی ئەو کەسە پێی ناوترێ نەزان بەڵکو ئەو کەسە پێی دەوترێ پشتهەڵکەر و کەمتەرخەم، کەوا پشت هەڵکردن و کەمتەرخەم بوون هەڵوەشێنەرەوەیەی ئیسلامە، هەروەکو شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب لە هەڵوەشێنەرەوەی دەیەمدا باسی لێوە دەکا، هەرکەسێ پشت هەڵبکات لە دینی الله تعالی و کەمتەرخەم بێت لە خۆ شارەزا کردن و فێربونی ئەوکەسە گومڕا دەبێ ودینەکەی هەڵدەوەشێتەوە و دینەکەی دەبێتە گومڕایی، جا الله تعالی دەفەرموێت : **(وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ ذُكِّرَ بِآيَاتِ رَبِّهِ ثُمَّ أَعْرَضَ عَنْهَا إِنَّا مِنَ الْمُجْرِمِينَ مُنْتَقِمُونَ)[السجدة/٢٢]** واتە: چ کەسێ لەوە ستەمکارترە کەوا بە ئایەتەکانی الله تعالی ئامۆژگاری دەکرێ و پاشان پشت هەڵدەکات لێی، بەڕاستی ئەو تاوانبارانە تۆڵەیان لێدەسەنین، جا کێ هەیە لە پاش رسول الله صلی الله علیه وسلم ئەم ئامۆژگاری و حوججەیەی رسول الله پێ نەگەیشتبێ؟ بەڵام بەداخەوە زۆرینەی

پشتیان لێی هەڵکردوە و بە نەزانی کەوتونە نێو کوفر و شیرک و کافر بونە-پەنادەگرین بە الله تعالى- وە هەروەها الله تعالى زۆر بە توندی ئاگادارمان دەکاتەوە و دەفەرموێت : **(وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَىٰ)[طه/١٢٤]** واتە: هەرکەسێ پشت لە قورئانەکەم بکات ئەوە ژیانێکی ناخۆش وتاڵی دەخەینە پێش و لە ڕۆژی دواییدا بە کوێری حەشری دەکەین.، جا بەڕاستی ئەو کەسەی لەتوانای دا نەبێت لە دینی الله تعالى خۆی شارەزا بکات ئەو کەسەیە کەوا: شێتبێ یان باڵغ نەبوبێ منداڵ یان کەسێ کوێر و کەڕ و ناتەواو کەموکوڕتیەکی هەبێ نەتوانێ نەزانین لەسەر خۆی هەڵبگرێت، جا بەڕاستی جگە لەمانە هەموو کەسێ لە توانای دایە و فەرمانی پێکراوە تێبکۆشێ و هەوڵبدات بۆ فێربونی دین، جا هەرکەسێ کەمتەرخەم بوو و نەزان بوو کەوتە نێو هەر کارێک هیچ عوزرێکی بۆ نیە، جا بەڕاستی نەزانین هەڵوەشێنەرەوەی ئیسلامە نەوەک ڕێگریەک بێ لە ڕێگریەکانی تەکفیر ئیمامی عمر{رضي الله عنه} دەڵێت:(هیچ کەسێک عوزری نیە لە گومڕایی گەر شوێنی کەوت و بە هیدایەتی بزانێت و هیدایەت واز لێ بێنێت و بە گومڕایی بزانێت، چونکە کارەکان هەمووی ڕوون کراونەتەوە و حوجەکان دامەزراون و جێگیر بوون و عوزر نەماوە و پچڕاوە)[رواه ابو يوسف و ابن شبة وابن بطة والخطيب البغدادي وابن الحزم وابن الجوزي وابو نعيم وابومحمد بربهارى]

ڕەحمەتی الله تعالى لە ئیمام بێت، ووتەکەی بەسە لەنێو گشت زانایان، وەک و فەرمووی کارەکان هەمووی ڕون بونەتەوە و حوجەکە دامەزراوا و جێگیر بووە و عوزر نەماوە و پچڕاوە، وە عوزر بۆ کەسێک نییە نەزان بێت شوێن گومڕایی کەوتبێ و پێی وابێ هیدایەتە و پێی وابێ هیدایەت گومڕاییە

الله تعالى دەفەرموێت : **(غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ)[الفاتحة/٧]** واتە: نەمانخەیتە سەر ڕێبازی ئەوانەی خەشم و قینیان بەسەرا دراوە وە ئەوانەشی کەوا گومڕا بوون.،جا ئیمامی سەعدی{رحمه الله} لە تەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆز و گەورەیەدا دەفەرموێ: **{غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ}**ئەوانەنە: کە حەقیان ناسی و زانیان پاشان وازیان لێیهێنا وەک و یەهودی و کەسانی

